موستەفا محمود

# مەتەڵی ژیان



وەرگێڕانی

باسیمە عەبدولستار

ناوی کتێب: مــەتــەڵی ژیـــان
ناوی نووسەر: د. موستەفا مەحمود
ناوی وەرگێر: باسیمە عەبدولســتار
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنــوێن
دیزاینی تێکست: زەردەشت کاوانی
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٢
چــاپ: نــاوەندی ڕێنــوێن
تیـــــراژ: (١٠٠٠) دانـــــە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە ( ١٤٠٤ )ـی ساڵی (٢٠٢٢)ـی پێ دراوە.









**ناوەندی ڕێنوێن**



07511408868 - 07501269689



hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com



سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

# مەتڵی ژیان

نووسینی

**د.موستەفا مەحمود**

وەرگێڕانی

**باسیمە عەبدولستار**





## مەتەڵەکە

حەقیقەت زۆر لە جادوو و خەیاڵ و پەرجوو سەرسوورهێنەرترە، بگرە ئەوە حەقیقەتە کە هەر بۆ خودی خۆی پەرجووە. لە ڕاستیدا هاتنەدەرەوەی من لە سکی تیمساحێکەوە و قووتدانی چەقۆیەک و دەرهێنانی خۆر لە لەپی دەستەکانمەوە پەرجوو نین، ئەمانە کۆمەڵێک یاریی بەهلەوانی و یاسابەزاندنن، پەرجووی ڕاستەقینەش بەزاندنی یاساکانی گەردوون نییە، بەڵکوو پەرجووی ڕاستەقینە لە بەرپایی خودی ئەو یاسایانەدایە. هەڵهاتنی خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە و سووڕاندنەوەی لە یەک خولگەدا لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا، هەموو ڕۆژێک و بۆ ماوەی ملیۆنەها ساڵ، زۆر بە وردی و ڕێکوپێکی، زۆر پەرجووانەترە لەوەی جارێک لە لەپی دەستمەوە هەڵبێت و جارێکیش لەژێر باڵمەوە. لە ڕاستیدا پەرجوویی گەردوون لەوەیدایە کە بە کۆمەڵێک یاسای پتەوی ورد ڕێک خراوە. پەرجووەکەی لەوەدایە، کە ئەگەرچی بارستاییەکی بۆش ڕزیو و کوێرە لە ماددە، بەڵام پڕە لە یاسا و ڕێکوپێکی و لە چەندین ئاوێتە و پێکهاتەی ئەندازەیی جواندا ڕێک خراوە.

لەوانەیە ئەو کابرا چاوبەستکارەی دەستەسرێک بە بەرچاوانتەوە دەکات بە دەیان پارچەوە و پاشان دەیگەڕێنێتەوە باری یەکەمی سەرسامت بکات، بەڵام ژیان هەموو ڕۆژێک خاکییانە و لەوپەڕی سادەییدا، زۆر لەم

گەمەیە سەرسوورهێنەرتر پێشکەش دەکات. ئەو ئیسفەنجەی گێژاوەکانی دەریا و ماسییە دڕندەکان دەیکەن بە هەزار پارچەوە و هەلاهەلای دەکەن، ئەوەندەی پێ ناچێت هەر پارچەیەکی بۆخۆی لەگەڵ ئاوەکەدا مەلە دەکات و گەشە دەکات و دەبێتەوە بە ئیسفەنجێکی نوێی کامڵ.تۆ هەر ناتوانیت وێنای ئەوە بکەیت کە ئەو ئیسفەنجە زیندەوەرە تا چ مەودایەک بەرگەی دڕاندن و پارچەپارچەکردن دەگرێت،بەڵام «پرۆفیسۆر ویڵسن» مامۆستای زانستی زیندەوەرانی هەڵسا بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەیەکی ناوازە، تیایدا ئیسفەنجێکی بە دەرزی کرد بە پارچەی زۆر زۆر بچووکەوە و پاشان بە چەکوش زۆر بەتوندی پیایدا کێشا و ئینجا هاڕی و لە قوماشێکی کونداری بچووکدا گوشیی، قوماشێک کونەکانی لە هێڵەک وردیلەتر بوون، سەرەنجام، پاش کەوتنە خوارەوەی لە هێڵەکەکە و پاش ئەو پارچەکردن و هاڕین و وردکردنە زۆرەی بۆی کرا، ئیسفەنجەکە توانی لە هەر خاڵێک و لە هەر گەردیلەیەکەوە دووبارە دروست ببێتەوە و گەشە بکاتەوە و، بگەڕێتەوە شێوە ئاساییەکەی خۆی، وەک ئەوەی هیچ هەر ڕووی نەدابێت.

ئەمە ڕاستییە، بەڵام لە هەمان کاتدا پەرچوویەکە و زۆر لە جادووی ئەو جادووگەرە سەرسوورهێنەرترە کە دەستەسڕەکەی کرد بە هەزار پارچەوە و پاشان سەرلەنوێ کردیەوە بە دەستەسڕ. من هەمیشە هەستم دەکرد لە سروشتی ژیاندا، سەرەڕای سادەییەکەی، نهێنییەکی قووڵ و مەتەڵێکی دەستەوەستانکەر هەیە، کە شایانی ڕامانی درێژخایەن و گەڕانی بەردەوامە.

ژیان هەمیشە سەرقاڵی کردبووم...

ئەم توانا بان-سروشتەی ژیان بۆ پڕکردنەوەی خۆی و، جەنگان لەگەڵ هێزەکانی پارچەپارچەکردندا و، پارێزگاریکردن لە خۆگرتوویی

و یەکگرتوویی لە ڕووبەڕووبوونەوەی دۆخگەلێک کە لە هەرساتێکدا پەرشوبڵاوی دەکەنەوە، هەمیشە ئەوەم پیشان دەدات کە سەرەڕای هەمەجۆریی بوونەوەرە زیندووەکان و ژمارەیان، کرۆکی ژیان هەر یەکێکە. تاقە کرۆک و جەوهەرێک کە بەسەر هەموو بەشێک و هەموو تۆزێکی پرۆتۆپلازمدا[1] پەرش کراوەتەوە، بە جۆرێک هەر بەشێک لەوانە بتوانێت کامڵ ببێت.

ئەو چەقۆیەی ئیسفەنجەکەی بڕی نەیتوانی جەوهەری ژیانی تیایدا ببڕێت، چوونکە ژیان شتێکی سادەی وەکوو سیفەت وایە و بەنێو هەموو بەشە زیندووەکاندا بڵاو بووەتەوە، شتێکە قابیلی بەشکردن نییە.

جا ئەوەی کە لەو ئیسفەنجەدا ڕووی دا لە زۆرێک لە ڕووەکەکاندا ڕوو دەدات، زۆرینەی ڕووەکەکان بە لێبڕینەوە گەشە دەکەن، هەر بەشێکی ببڕیتەوە و بیڕوێنیتەوە، گەشە دەکات و بونیادێکی نوێی بۆ دروست دەبێت و هەڵدەستێت بە دووبارە دروستکردنەوەی هەموو ئەو بەشانەی کە لێی کەمە. ئەمەش دەرخەری ئەوەیە کە هەر بەشێکی ڕووەک بە جۆرێک لە جۆرەکان هەڵگری هەموو ئەو وردەکارییانەیە کە لە ناواخنی ڕووەکەکەدا هەن، بەتەواوی وەک چۆن کۆرپەلە لە کرۆکی خانەکانیدا هەڵگری وێنەی مرۆڤە بە هەموو ئەندامەکانیەوە.

گەر لقێکت لە دارچنارێک کردەوە و چاندت، ئەوەندە نابات گەشە دەکات و دەبێتەوە بە درەختێکی تەواو، لە بەشی خوارەوەی لقەکەوە ڕەگ دەڕوێت و لە بەشی سەرەوەش لقی نوێ، ئەگەریش لقەکە سەراوژێر بکەیتەوە، ئەو کات ڕەگەکان لە ژێرەوە و لقە نوێیەکانیش لە سەرەوەی دەردەچن، ئەمەش دووبارە نیشاندەری ئەوەیە کە هەر پنتێک

---

(١) کۆی پێکهاتەکانی خانەی زیندوو

لە شانەی ئەو لقە توانای ئەوەی هەیە لە هەمان کاتدا گەشە بکات بۆ ڕەگ و گەشە بکات بۆ لق. ڕووەکیش بەپێی دۆخی خۆی هەڵدەبژێرێت، ئەو بەشەی دەکەوێتە خوارەوە ڕەگی لێوە دەردێت و ئەوەشی سەر دەکەوێت لقەکانی لێوە دەڕوێت. ئەمەش واتا جەوهەری ژیان کۆکەرەوەی هەموو تواناکانە، توانای لق و توانای ڕەگ لە هەمان کاتدا و، قابیلی بەشبەشکردن نییە و، هەرچەندە شانەی زیندوو پارچەپارچە بکەیت هەر پارچەیەک بۆخۆی کۆکەرەوەی هەموو تواناکانی بوونەوەرێکی زیندوو دەبێت.

ئیدی لەبەر ئەم هۆکارە،لەسەرەتادا ژیان لە ئاستەکانی خوارەوەیدا فانی نەبوو. میکرۆبەکان نەدەمردن، بەڵکوو کاتێک دەگەیشتنە خاڵی پێگەیشتن، دابەش دەبوون بە جۆرێک هەر بەشێک بەتەنها توانای گەشە و پێگەیشتنی هەبێت، پاشان دەگەڕایەوە، پاشان دابەش دەبوویەوە، ئیدی دانەیەک دەبوویە دووان و پاشان چوار و پاشان هەشت و پاشان شانزە و هتد... بەبێ ئەوەی ژیان بە پیربوونی یەکێکیان بکوژێتەوە. پیربوون و مردنیش بە دەرکەوتنی جۆرە باڵا ئاڵۆزەکانی ئاژەڵ و ڕووەکەکان و، بە دەرکەوتنی خانە توخمییە ئاڵۆزەکانی تایبەتمەند لە زۆربوون و گواستنەوەی ژیان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی نەبێت، دەرنەکەوتبوون.

مردن باجی تایبەتمەندبوونە، تایبەتمەندبوونی خانەگەلێک لە گواستنەوەی ژیاندا، ئیدی وای لێ هات ڕۆڵی بوونەوەری زیندوو پاش پێکهێنانی ئەم خانە توخمییانە و گواستنەوەیان بە پیتاندن و جووتکردن کۆتایی بێت، بە جۆرێک بەم ڕێگایانە نەوەی نوێ دەخرێنەوە و پاشان دەمرن و ژیانیان کۆتایی دێت.

بەڵام پێش ئەم تایبەتمەندبوونە، توانای ژیان و نوێبوونەوە بە هەموو شانەی زیندوودا پەرش بووبووەوە.

**ژیان چییە و نهێنییەکەی چییە؟**

ئەوە کێیە زەڕنەقوتەی فێرکردووە کە هێلکە لە لاوازترین شوێنیەوە بتروکێنێت و بێتە دەرەوە. کێ فێری باڵندەکانی کردووە بەنێو زەریا و بیابانەکاندا کۆچ بکەن و بچنە شوێنێک کە خواردنی زۆرتر و کەشوهەوای باشتر بێت و بۆ زۆربوونیان گونجاو بێت و، ئەوە کێیە بە درێژایی ئەم گەشتە و هەزاران میل هەنگاوەکانیان ڕاست و دروست و پاڵپشت دەکات، ئیدی نە ون دەبن و نە ڕێیان لێ تێک دەچێت. کێیە کرمی ئاوریشمی فێر کردووە جار لەدوای جار بەرگ و پۆشاکی خۆی بچنێتەوە، پاشان بچێتە سووچێکەوە تا قۆزاخەیەک لە ئاوریشم بۆ خۆی دروست بکات، چەندین شەوگاری دووروودرێژ هەر وەکوو یارانی ئەشکەوت تیایدا بخەوێت و، دواتریش هەر لەوێوە ببێتە پەپوولەیەکی سپیی جوانی نەخشین و بێتە دەرەوە.

ئەم گواستنەوە ڕێکخراوە وردە لە شێوازێکی خانەوە بۆ شێوازێکی دی و ئەم پەرەسەندنە لە کرمێکەوە بۆ مێروو کە بە ملیۆنەها خانە بەشداریی تێدا دەکەن، خۆکردانە و بەبێ مامۆستا ڕوو دەدات.چوونکە مامۆستا لێرەدا ئەو سروشتە ڕێنوێنیکارەیە کە لە ماددەی زیندوودا چێندراوە، بە جۆرێک کە هیچکەس نازانێت چۆنە.چیرۆکی ژیانی خانەی زیندوو بە کۆدێکی پرۆتۆپلازمی لە ماددەی خانەکەدا نووسراوەتەوە.

باشە ئەوە کێیە سەرەمێکوتەی فێر کردووە کاتێک کلکەکەی دەبڕێتەوە کلکێکی نوێ بۆ خۆی دروست بکات، هیچکەس، لە ڕاستیدا

زانست لە ناواخنی خانەکانیدایە، هەر خانەیەک ڕۆڵی خۆی دەزانێت و پێی هەڵدەستێت. بە هەمان شێوە بۆ ئێمەش کاتێک بریندار دەبین، برینەکانمان خۆکردانە سارێژ دەبن، کاتێکیش درەختەکان زامدار دەبن، بە شانەیەک لە فلین نێوانی برینەکان پڕ دەکەنەوە و سارێژ دەبن. دووبارە هەر وەکوو خۆمان، بەبێ زام و برین و بەبێ نەخۆشی، کە چۆن جەستەمان بە پەرجووە ناوەکییەکانی، لە سەرما و گەرمادا پلەیەکی گەرمیی جێگیرمان بۆ دەستەبەر دەکات و لە دۆخی جیاوازی تێری و برسێتیدا کێشێکی جێگیرمان بۆ دەهێڵێتەوە و لە ڕووبەڕووبوونەوەی چەندین سوپای وردە زیندەوەر و میکرۆبەکان پارێزگاری لە یەکێتی و سەلامەتیی خۆی دەکات و، شەو و ڕۆژ کار دەکات بۆ لەناوبردن و پەرتکردن و هەرسکردن و قووتدانی ئەو میکرۆبانە.

ئەم هاوسەنگییە وردەی کە بە هۆکاری چالاکی و جووڵەی بەردەوامی ناو خانەکان بۆ ڕاستکردنەوەی هەر هەڵەیەک بەدی دێت، جێگای بیرکردنەوەیە. ژیان وەکوو سەماکەرێکی سەر پەتێکی ڕاکێشراو وایە، کە شوێنی پرۆگرامێک کەوتووە تا لە هەر ساتێکدا هەنگاوەکانی ڕاست بکاتەوە.هەر ئەمەشە لەناو خانە زیندووەکاندا ڕوو دەدات، لەناو خانە زیندووەکاندا ڕاگرایەتییەکی خۆیی، پرۆگرامێکی بەرهەمهێنەریی و، بەباڵاداخوێندنێکی بەردەوام هەیە بۆ ئامانجێکی لەبنەڕەتەوەدانراو. گەشەی پێداگرانەی لقێک لە دارچنار بۆ درەختێکی چنار، بەڵگەی ئەوەیە کە کۆی بەرنامەی گەشەکردن لە خانە بچووکەکانی ئەو لقەدا نەخشێنراون. لەم خانانەدا مۆرکێکی بنەڕەتی و بەئامانجگرتنێکی سروشتی بۆ تەواوکاری و، وێنەوەرگرتن لە وێنەیەکی کامڵدا کە هاوشانی وێنە بنەڕەتییەکە بێت و بگرە سەروو ئەویش بێت، بوونی هەیە. دەرخەری ئەوەن ئەم لقە سروشتێکی

ڕێنوێنیکاری تێدا بووە، هەنگاوبەهەنگاو جووڵەکەی بەرەو گەشەی لقدار و ئاڵۆز بەڕێوە بردووە.کە ئەویش جووڵەیەکی ئاسان و پارێزراو و سەلامەت نییە، بەڵکوو وەکوو جووڵەی پاڵەوانێکە لەسەر پەتێکی ڕاکێشراو، جووڵەیەکە مەترسییەکان هەڕەشەی لێ دەکەن، ئەو لقە بچووکە لە ڕووبەڕووبوونەوەی چەندین زریان و گەرمی و ساردی و وشکەساڵی و پەلاماری کەڕووەکاندا سەرکەوتوو بووە و گەشەی کردووە و لە هەنگاوبەهەنگاوی ئەم گەشەکردنە هێواشەدا پارێزگاریی لە یەکێتی و سەلامەتی و هاوسەنگی و قەوارەی خۆی کردووە. هەموو ئەم چالاکییانەش کە ڕێکوپێکی و سەلامەتی دەبەخشنە ماددە و ئەم یاسایانە، خودی ژیانن.

ئەوە ژیانە ماددەی بۆشی کردووەتە خاوەن وێنە و خاوەن شێوە و خاوەن یاسا و ڕێکوپێکی. بەبێ ژیان ماددە ئەو هەیکەلە جوان و وێنە کێشراوەی پەرت دەبێت و شی دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ گڵ. جەستەی جوانی زیندووی گونجاو و چوست و چالاک، کە بە یاسا و نیزامەوە مامەڵە دەکات و ئەو یاسا و نیزامەی خۆی بەسەر دونیای چواردەوریدا دەسەپێنێت، بە مەرگ دادەڕمێت و شی دەبێتەوە و دەبێتەوە بە گڵ.

ئیدی ڕاڤەی زانستی ژیان بەوەی کە چالاکییەکی کیمیاییە، ڕاڤەیەکی تەواو و بەس نییە، چوونکە دەی جەستەی مردووش هەمان ئەو ماددە کیمیاییانەی تێدایە کە لە جەستەی زیندوودا هەیە، گڵیش هەمان ئەو پێکهاتانەی لە ئاسن و مس و کاربۆن تێدایە. هەر وەک چۆن وتنی ئەوەی گوایە ئارەزووی سێکسی هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن هانی دەدات، ئەو ئارەزووەمان بۆ ڕاڤە ناکات، چوونکە ئەو کات دەڵێین: ئەی ئەو هۆکارە چییە تێستۆستیرۆنی لە جەستەدا دروست کردووە؟

بە هەمان شێوە بۆ زانای ڕووەکناس کە پێمان دەڵێت جووڵەی ڕووەکی گوڵەبەڕۆژە ڕووە و خۆر، هۆرمۆنی (ئۆکسین) ڕێکی دەخات، ئێمە بەم قسەیە وا دانانێین کێشەکە چارەسەر بووە، بەڵکوو دەپرسین: ئەدی ئەو هۆکارە چییە ئەم ماددە هاندەرەی دروست کردووە و ڕێژەکەی لە شانەکانی ڕووەکەکەدا ڕێک دەخات؟

لە ڕاستیدا پێکهاتەیَ کیمیایی خانە نهێنیی ژیانمانیان بۆ ئاشکرا ناکات، چوونکە ژیان بەتەنها ڕژێمێکی بێگیانی وەکوو ماڵ یا کارگە نییە، بەڵکوو ڕژێمێکە توانای خۆدووبارەکردنەوە و سەرکەوتن بەسەر خۆیدا هەیە، سروشتێکی ڕێنوێنیکاری تێدایە لە ناوەوە بەڕێوەی دەبات. سروشتێکی پەرشکراو بەنێو شانەکانیدا، هەرچیی خراپ بووبێت نوێی دەکاتەوە و هەرچییش لەدەست چووبێت دروستی دەکاتەوە.

مەتەڵەکەش لەم بینابیەدایە کە لە چەند هێندەکانی ماددەدا شاردراوەتەوە، نەک خودی پێکهاتەی ماددەکە.

کێشەکە پێویستی بە بیرکردنەوەی زیاتر هەیە!



## درەختە قەدەغەکراوەکە

ئێمە بەبچووکی دێینە دونیاوە و لەگەڵ تەمەندا گەشە دەکەین تا بگەینە گەنجی و پاشان گەورەتریش دەبین، دواتریش پیری تێمان بەردەبێت و بەساڵا دەچین و دەمرین. ئەمەیە حاڵی ئێمە و حاڵی زیندووانی چواردەورمان. سوورڕێکی حەتمییە، بە گەشەکردوویی و براوەیی دەست پێ دەکات و تاجی سەرکەوتنی لەسەر نراوە و، دواتر بە دۆڕاوی و شکستخواردوویی کۆتایی دێت و مردن مۆری ئەزەلی خۆی لێ دەدات.

بەڵام، پێش سێ هەزار ملیۆن ساڵ کە ژیان دەستی پێ کرد، حاڵی بەم جۆرە نەبوو. بە تاقە بوونەوەرێک دەستی پێ کرد، کە لە ڕاستیدا تاقە خانەیەک بوو لە گۆماو و زەلکاوەکاندا مەلەی دەکرد و، ئەم زیندەوەرە مەرگی بەم شێوەیەی ئێستا ئێمە دەیزانین، پێنەدەزانی. بۆ ئەو، مەرگ بە ڕووداوێکی دەرەکی نەبووایە یەخەی نەدەگرت، وەکوو ئەوەی گۆماوەکەی وشک بکات یا زیندەوەرێکی دی گەورەتر لە خۆی قووتی بدات یا ئەوەتا تۆفانێک، زریانێک، شتێک دابباریتە سەری، وەلێ ئەوەی وەکوو ئێمە هەر وا و لەپڕ و بەبێ بوونی ڕووداوێک و لە بوونی خۆراکی زۆر و بارودۆخی گونجاو لە کۆتاییەکانی تەمەندا، ئەوەی کە مەرگ لە ناوەوە تێی بەر ببێت و وەکوو ئێمە پیر بێت، شتی

لەم چەشنە ڕووی نەدەدا، ئەو لە ناوەوە دژ بەم مەرگە پیسە پڕچەک بوو، سووڕی ژیانی ئەو سەیر بوو، ئەوەی لەگەڵ بەرەوسەرچوونی تەمەندا بەسەریدا دەهات پێچەوانەی ئێمە بوو، ئەو گەشە دەکات و گەشە دەکات و گەورە دەبێت بۆ ئەوە نا گەورەیی بیداتە دەستی پیری، بەڵکوو تا بیداتە دەستی ساواییەکی نوێ، ئەوسا کە دەگاتە لووتکەی گەشەکردنی دابەش دەبێت وەک چۆن دارعەسایەک دەبێتە دوو بەشەوە، دەبێتە دوو بوونەوەر و هەریەکێکیان سەر لەنوێ ساوایەکە لە یەکەمین قۆناغەکانی گەشەکردنیدا.پاشان ئەو دووانە دەبنە چوار و پاشان هەشت و پاشان شانزە و دواتر سی و دوو و دواتر شەست و چوار ئیدی چەند هێندی تری ژمارکاریی دوور لە مەرگ و دوور لە نەمان بە ڕووداوێک. تا ئێستاشی پێوەبێت حاڵی میکرۆبەکان لە دابەشبوون و زۆربوونیاندا بەم شێوەیەیە.

نە مردن، نە نێر و مێ، نە زۆربوون و نە خانەی زاووزێ، بەڵکوو خودی خانەکە دەبێتە دووان بەبێ هاوکاری کەسی دی. ئیدی ئەم تاقە خانەیە تەنانەت دژی ڕووداوەکانیش پڕچەک بوو، زووزوو خۆی دەخستە بەرگێکی ئەستوورەوە و لەناویدا دەنوست و دەگۆڕا بۆ میکرۆبێک نە وشکی و نە سەرما و نە گەرما کاری لێ نەکات. ڕووی داوە میکرۆبی وا لەژێر بەستەڵەکی جەمسەری باشووردا دۆزراوەتەوە، کە ماوەی زیاتر لە ١٣ هەزار ساڵ بووە لە بەرگەکەیدا نوستووە، یاخود لەژێر کان و گڵدا میکرۆبی وەها دۆزراوەتەوە، کە مێژووەکەی گەڕاوەتەوە بۆ زیاتر لە ملیۆنێک ساڵ، دواجار توانراش ئەم میکرۆبانە لە تاقیگەدا مۆڵگە بکرێن و دووبارە بگەڕێندرێنەوە بۆ ژیان.

خانەی یەکەم تا ئەم ڕادەیە توانیویەتی مەرگ ببەزێنێت.

هەروەها بینیشمان ئەم خانەیە هەڵدەستێت بە هەموو ئەرکەکانی ژیان. بەشێکیان شێوەی قامچی یا برژۆڵە و گەندەپێ وەر دەگرن و توانای جووڵەی پێ دەبەخشن، بەشێکی تریشیان دەچنە سەر شێوەی بۆشایی و ناوپۆشێکی ڕیخۆڵەیی و خواردن هەڵدەگرن و هەرسی دەکەن، بڵقێکی ناوەکییش لە ناوەڕاستی شلەی خانەیی خانە زیندووەکەدا ڕۆڵی گورچیلە دەبینێت و ئەو ئاوەی زیادە و پێویست نییە دەکاتە دەرەوە. ئیدی ئەم بازدانانە لە شێوە و تواناادا بەردەوام لە بەرزبوونەوەدا بوو، لەگەڵیشیدا خانەکە بە درێژایی ئەو کاتە پارێزگاریی لە یەکێتی و ژیانی بەردەوامی دەکرد، هەموو ئەمانە بەتەنها و دوور لەوانی تر. دواتر خانە لە یەک جوداکان دەستیان کرد بە کۆبوونەوە لە کۆمەڵە و تاقم و خێزانەکاندا، پاشانیش ئەم تاقمانە دەستیان کرد بە پێکەوەنووسان و پەیوەندیکردن بەیەکەوە و گۆڕان بۆ شانەی فرەخانە. ئیدی لێرەوە دیاردەیەکی نوێ لەم بوونەوەرە فرەخانەیەدا وردەوردە دەر دەکەوت، ئەویش دیاردەی تایبەتمەندییە، کۆمەڵێک خانە تایبەتمەند دەبن بە جووڵە و کۆمەڵێک خانە بە کردنەدەرەوەی پاشەڕۆ و کۆمەڵێکی تریش تایبەت بە هەرسکردن.

دواتریش هەڵە گەورەترینەکە ڕووی دا، ئەویش گەشەپێدانی ئەندامێکی تایبەت بە زاووزێ بوو بۆ بوونەوەری زیندوو، بوونی خانەی تایبەت بە زاووزێ ئەوە دەگەیەنێت ئیدی خودی بوونەوەرەکە لێرە بەدواوە بوونەوەرێکی کاتییە، نیاز بەو بوونەوەرە نیازێکی کاتییە. چیدی تەنها هەڵگرێکی تۆوەکانە. تەنها نێوەندێکە تۆو یان هێلکەکان لە خۆیدا هەڵدەگرێت، هەر ئەوەندە گواستینیەوە و لە کردارێکی پێتێندا لە شوێنێکی دیکە چاندنی، ئیدی ڕۆڵی تەواو دەبێت و پێویستمان پێی نامێنێت و دەبێتە میوانێکی ڕەزاگران کە کەس کاری پێی نییە و تەنها

دەخوات و دەخەوێت، چوونکە ژیان گوازرایەوە بۆ نەوەیەکی نوێ و زۆربوون لە ڕێگەی خانە زاوزێییەکانەوە ڕووی دا و ئیدی هۆکارێک بۆ بەردەوام بوونی نییە.

لەو مێژووە بەدواوە مەرگ دەستی کردووە بە تیرۆرکردنی ئەم بوونەوەرە تایبەتمەندە بالآیانە لە ناوەوە و تووشی پیری و وەرین و لەناوچوونیان دەکات. هەندێ جاریش ڕوو دەدات ئەم سەرەنجامە لە وێنەیەکی زۆر دراماییدا دەبینین، بۆ نموونە مێرووی (مێشی مایۆ)، گەشەکردنەکەی چەندین ساڵی پێ دەچێت تا دەگاتە پێگەیشتن، بەڵام دەگات و ناگات و هەر یەک ڕۆژ دوای پێگەیشتنی، لە شەوی بووکێنیدا و ڕاستەوخۆ پاش پیتاندن مردنێکی زۆر دراماییی دەمرێت.

تا ئەم ئاستە ژیان دڵڕەقە لە دەستبەرداربوونی تاکەکانیدا، هەر ئەوەندە لەسەریان دەوەستێت لە ئەرکی بەردەوامیدان بە جۆرەکانیان تەواو بن. کەواتە مەرگ باجی ڕەگەزە و لەگەڵ دەرکەوتنی نێر و مێدا و لەگەڵ یەکەمین پێکگەیشتنی سێکسی و ڕەگەزیدا دەستی پێ کرد. پرسیارە حەیرانکەرەکەش ئەوەیە کە بۆچی ژیان پەنای بردە بەر ئەم ڕێگا گرانجان و قورسەی زۆربوون، ڕێگایەک باجەکەی مردن بوو، لە کاتێکدا خۆی زۆر لێهاتووانە زۆربوونی دەکرد و بەو ڕێگا سەرەتاییەی خۆی کە دابەشبوونە، زۆر چالاکانە بڵاو دەبووەوە.

زانایانی ژیان پێمان دەڵێن ئەوە سەختی بارودۆخ و دڕندەیی ژینگەیە ئەوەی لە بوونەوەرە زیندووەکان خواستووە کە بگەڕێن بەشوێن ڕێگایەکی نوێدا بۆ بەرهەمهێنانی وەچەیەکی بەهێز،وەچەیەک بتوانێت بەرگە بگرێت و ڕووبەڕوو ببێتەوە. دابەشبوون ئەنجامەکەی وەچەیەکی لاواز بوو کە بەبێ هیچ بۆزیادکراوێکی نوێ خۆی دووبارە

دەکردەوە و لەم حاڵەشدا گەر مەرگ بە هۆکاری ڕووداوێک ڕووی بدایە، هەڕەشەی لەناوچوونی بۆ سەر هەموو جۆرەکە دروست دەکرد، چەندە زۆرن ئەو جۆرانەی دەزانین کە لەناوچوون و چەندینیش کە ئێمە هەر نایانزانین، بۆیە چارەسەر بریتی بوو لە داهێنانی شێوازێکی هاوشێوەی کوتان (واتە زۆربوون بە ڕێگای توخمەزۆربوون) ئیدی بەم چەشنە ئەو جۆرە زۆربوون دەکات و لەهەر پرۆسەیەکی زۆربوونیشدا شتی نوێی بۆ زیاد دەکرێت و وەچەیەکی بەهێز بەرهەم دێت، بەم چەشنە چارەسەرە توانرا جۆرەکان لە لەناوچوون و مەرگ ڕزگار بکرێن، بەڵام لەبەرامبەر باجێکی گەورەدا، ئەویش ئەوە بوو مەرگ ببێتە پەڕاوێکی نووسراو لەسەر تاکەکان.

ژیان جۆرەکانی لە مردن ڕزگار کرد تا ئەو تاکانەی چیدی بوونەتە تەنها هەڵگر و پارێزەر و ئەرشیفی تایبەتمەندییە بۆماوەییەکان، بمرن. لەو نامە وردانەدا کە ناویان تۆواو و هێلکەیە، ژیان دەگوازنەوە و دەگەیەنن و پاش بەئەنجامگەیاندنی ڕۆڵەکەیان دەمرن.

لە ڕاستیدا ژیان لە درەختە قەدەغەکراوەکەی خوارد، ڕێک وەکوو چۆن ئادەم لێی خوارد، ئیدی ڕۆڵەکانی لە کاتێکدا خۆیان دانیشتووی بەهەشتی هەتاهەتایی بوون، بوونە دانیشتووی فەنایی و لەناوچوون!

تۆ بڵێیت ئەمە ئەو هۆکارە ناوەکی و قووڵە بێت کە وای لێ کردووین چێژی سێکسی بە نزمی و داڕووخان دابنێین؟چوونکە بەڕاستی ئێمەی لە لووتکەی نەمرییەوە بەرەو چاڵی فەنایی خستە خوارەوە و ئێمەی کردە هۆکاری لاوەکی بۆ گواستنەوەی تۆوی ژیان، لە کاتێکدا ئێمە بوونەوەرگەلێک بووین خودی خۆمان مەبەست و ئامانج بووین، نەک هیچ شتێکی دی.

ئاخۆ دەکرێت خۆمان لەم مەرگە نووسراوە ڕزگار بکەین ئەگەر بێت و هۆکارێکی دیکەمان جگە لەم توخمەزۆربوونە پێشکەشی ژیان کرد تا پارێزگاری لە جۆرەکانی بکات و زاوزێ بکات!

ئاخۆ تاقیگەی بایەلۆجی بتوانێت مێژوو بگۆڕێت و مەرگ ببەزێنێت؟

ئەمە تەنها پرسیارە.



## دراکۆلایەك بە نێوی ڤایرۆس

کەسمان نییە دراکۆلا نەناسین، ئەو پیاوە شەیتانەی بەمردوویی تەواوی ڕۆژ لە تابووتەکەیدا دەخەوێت و هەر ئەوەندە شەو داهات سەرشێتانە دەست دەکات بە گەڕان بەدوای قوربانییەک لە بەنی ئادەمدا تا خوێنی بمژێت. هەر کەڵبەکانی گەیشتن بە گەردنی ژنێک، لەنێو باڵەکانیدا دەتوێتەوە و تا دوا دڵۆپی خوێنی دەمژێت. ئیدی لە قوربانییەکەوە بۆ قوربانییەکی دی، جارێک لەسەر شێوەی پیاوێک و جارێکیش لەسەر شێوەی شەمشەمەکوێرەیەکی ڕەشی تۆقێنەر. شەو باخ و یاریگای ئەوە و ڕۆژیش دوژمنی. خۆر ئەو دێوەزمەیەیە کە پێی ناوێرێت، هەر ئەوەندە یەکەم تیشکی گزنگی بەیان هەڵهات، ئەو بەهەڵەداوان و بەتۆقیوی دەچێتەوە نێو تابووتەکەی تا بە درێژایی ڕۆژەکە بێ گیان و جووڵە تیایدا ڕابکشێت، بە جەستەیەکی ساردوسڕەوە و نووزەی لێوە نایات.لەگەڵ یەکەم هێڵی تاریکایی و یەکەم ژەمی نوێی خوێنێکی زیندووی گەرمی تازەدا نەبێت تا هەڵی قورپێنێت، ژیانی بۆ ناگەڕێتەوە.

ئەم کەسایەتییە ئەفسانەییە دزێوەی کە زۆر جار بەدیاریەوە لەسەر شاشەی سینەماکان دانیشتووین و لە ترسی جووڵە تۆقێنەرەکانی هەڵلەرزیوین، کە بینیومانە چۆن بەدزەدز هێرشی کردووەتە سەر

قوربانییەکانی خوێن لە دەمارەکانماندا بەستوویەتی، هەناسەمان وەستاندووە و چاومان تێ بڕیوە چۆن بووەتەوە جەستەیەکی سارد لە تابووتەکەیدا، وەک بڵێی بووەتە بەشێک لە پێکهاتەی تابووتەکە. کاتێکیش لە سینەما دەگەڕاینەوە و بە هەنگاوە لەرزیوەکانمان شەقامە تەڕەکەمان تەی دەکرد، ئاوەزمان دەیپرسی ئاخۆ ئەو دێوە دوورەی لەژێر ئەو گڵۆپەدا وەستاوە دراکۆلایە؟ تۆ بڵێی ئێستا هێرش بکاتە سەر ملمان تا خوێنمان بمژێت و ئێمەش لە ترساندا تێی تەقێنین! ئیدی هەر ئەوەندە بەیەکداکێشانی باڵەکانی شەمشەمەکوێرەیەکی شاردراوەی نێو تاریکاییمان بینی لە ترساندا هەڵدەبەزینەوە، ئەوە دراکۆلایە.

ئایا دەکرێت ئەو شەمشەمەکوێرەیە دراکۆلا بێت؟

ئایا دراکۆلا کەسایەتییەکە بوونی هەیە، یاخود تەنها ئەفسانەیەکە؟

ئەو مردووە زیندووەی بە هەزاران ساڵ دەژی و هەموو ڕۆژێک بەو خوێنەی دەیمژێت گەنجیی نوێ دەکاتەوە و ئیدی نە پیر دەبێت و نە لەناو دەچێت، بە ئەندازەی ژمارەی قوربانییەکانی زیاد دەکات، هەر قوربانییەک خوێنی دەمژرێت، دواجار ئەویش دەگۆڕێت بۆ دراکۆلا.ئەم گەلە نەفرەتلێکراوە لە ئیبلیسەکانی تاریکایی کە دەچنە نێو گۆڕستان و بچنە هەرکوێ وێرانی بڵاو دەکەنەوە، ئایا دەکرێت بوونیان هەبێت؟!

ئەوان دەڵێن دراکۆلا ئەفسانەیە. بەڵام من دەڵێم دراکۆلا بوونی هەیە و ناویشی ڤایرۆسە.

لەوانەش بێت بە خەیاڵی دانەری ئەو ئەفسانەیەدا هەر نەهاتبێت کە ئەو پاڵەوانەی لە زادەی خەیاڵەوە دای هێناوە؛ گەورەترین ڕاستییەکە لەسەر ئەم زەوییە هەیە. چوونکە ئەو کاتەی ئەم ئەفسانە ملیلییە کۆنە

دەر کەوت، ڤایرۆس هێشتاکێ نەناسرابوو. بەڵام لە دیدگای منەوە، هونەرمەند ڕێگای شاراوەی خۆی هەیە بۆ درککردنی شتەکان، ئەو نە بە وردبین و تەلیسکۆب و نە بە ئاوەز و نە بە ژمارکاری و لۆجیکیش شتەکان ئاشکرا دەکات، بەڵکوو ئەو بە چاوێکی ناوەکی شتەکان دەبینێت، بە هەستی شەشەم، بە چاو نا، بە بینایی.

دانەری ئەفسانەی دراکۆلاش وڕێنەی نەدەکرد، خەیاڵەکەشی زادەی شێتی نەبوو، چوونکە ئەوەتا جیهانی نوێ بوونی دراکۆلای سەلماند.ئەو مردووە زیندووە، ئەو بوونەوەرە مەتەڵەی ناوی (ڤایرۆسە). هەموو جیاوازییەکە لەنێوان ئەفسانە و ڕاستەقینەدا ئەوەیە کە دراکۆلای ڤایرۆس بوونەوەرێکی زۆر قەبارە بچووکە. وردتر لە هەموو میکرۆبە ناسراوەکان و بە چاوی سەر نابینرێت و بە وردبینیش هەر نابینرێت، بە توێکارییش ناتوانرێ لەو شلانە جیا بکرێتەوە کە لەخۆی گرتووە، چوونکە ئەو لە دەست وردترین ڕێگاکانی توێکاری دەرباز دەبێت، ئەو هاوشێوەی بایە، هاوشێوەی بۆشایی!

بەڵام ڕۆژانە بە هەزاران دەکوژێت و دەفەوتێنێت. سەرژمێرییە نوێیەکان پێمان دەڵێن کە ٦٠٪ی ئەو نەخۆشییانەی تووشمان دەبن هۆکارەکەیان ڤایرۆسە، هەر وەک چۆن تووشی ئاژەڵ و مرۆڤ دەبێت، ئاوا تووشی ڕووەکیش دێت، هەر وەک هەندێک جار یەخەی میکرۆبی ورد و بچووکیش دەگرێت و دەیکوژێت.

هەڵامەت، ئەنفلۆنزا، ئاوڵە، سووریژە، هاری، ئیفلیجیی منداڵان، زەردوویی، ڕژێنی نەکفی، هەوکردنی مۆخ، هەوکردنی پەردەی مێشک، شێرپەنجە، تراکۆما، هەموویان نەخۆشیی ڤایرۆسین و هاوشێوەی ئەمانە و زیاتریش، لە ئاژەڵ و ڕووەکیشدا.

ڤایرۆس، دێوێکی بەرەڵاکراوە، ژمارەی بە ملیۆنەهایە، بەدوای ژیاندا هەناسەبڕکێیەتی لە هەرکوێیەک و هەرچۆنێک بێت، تا چەند ساڵێکیش نەبێت کە وردبین داهێنرا، شێوە و وێنەی نادیار بوو.بە داهێنانی ئەو وردبینەی کە توانای گەورەکردنی وێنەی لە دوو سەد هەزار جار زیاترە، بۆ یەکەم جار توانرا ئەم دێوە ببینرێت و ئەنجامی بینینەکەش ناوازە بوو. ئەوەی لەژێر وردبیندا دەر کەوت میکرۆبێک نەبوو وەکوو میکرۆبەکانی کۆلۆن یا مەلاریا یاخود کۆلێرا بجووڵێت، تەنانەت خانەیەکیش نەبوو سیفەتە زانراوەکانی خانەی زیندووی هەبێت، بەڵکوو کۆمەڵێک بلووری هاوشێوەی بلووری خوێی چێشت بوون، یاخود شەکری بۆدرە، تەنها ماددەیەکی پرۆتینیی ناوەکیی ناسراو بە پیتەکانی DNAـە، ترشی دایۆکسی ڕایبۆنیوکلییەک[1]، کە ئەویش ماددەی ناو ناوکی خانەی زیندووە و تایبەتە بە کۆپیکردنی نموونە و سیفەتە بۆماوەییەکانی خانە، زیاتر لە فۆرمێکی چاپکراو دەچێت کە بە هەزاران و ملیۆنەها دانەی بە ڕۆینۆ یاخود ڕۆتۆگراڤیۆر[2] لێ کۆپی دەکرێت، بەپێی ئەو بزوێنەرەی لەژێر دەستیدایە یاخود ئەو قاڵبەی شێوەکار هەرچییەکی بوێ تێی دەکات، یاخود ئەو نموونەیەی بە هەزاران کراسی لەسەر دەدورێت. ئێستا لە زانستی بۆماوەییدا ئەوە زانراوە کە هەموو خانەیەک لەناویدا نموونەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە و خانە نوێیەکانی بە باڵای ئەودا دەدورێت، بەمەش پارێزگاری لە مۆرک و کەسایەتیی خۆی لە کاتی گەشەیدا دەکات و پاش مەرگی خۆی دەیکاتە میراتی بۆ ڕۆڵەکانی.

ئەم نموونەیە لەم ماددە جادووییە دروست کراوە. ئەم ماددەیەش لای خۆیەوە ماددەیەکی زۆر ئاڵۆزە و لە زیاتر لە بیست ترشی ئەمینی

---

(١) ناوی زانستی ترشی دی ئین ئەی

(٢) جۆری ئامیری چاپکردنی زیرەکن

پێکەوەبەستراو دروست کراوە، وەکوو پێکەوەبەسترانی پیتەکانی ئەلف و بێ تا کۆدێکی تایبەت لە هەر بوونەوەرێکی زیندوودا پێک بهێنن. ئەم کۆدە کیمیاییە هۆکاری سەلماندنی کەسایەتیی تایبەتی هەر بوونەوەرێکە. ئەو نموونەیەیە کە وەکوو چۆن مرۆڤ بە پەنجەمۆری خۆی دەناسرێتەوە، ئاوا پێی دەناسرێتەوە. ماددەیەکی زاڵە بەسەر ماددەکانی دیدا و دەتوانێت هەرچەندێکی پێ خۆشە کۆپی لەسەر شێوەی خۆی چاپ بکات.

زانایانی زانستی بۆماوەزانی بابەتەکەمان زیاتر بۆ ڕوون دەکەنەوە و پێمان دەڵێن کە هەموو خانەیەک بنەڕەتێک و وێنەیەک لەو نموونەیە لەخۆ دەگرن، بنەڕەتەکە لەناو ناوکی خانەکەیدا و لە DNA دروست کراوە و، وێنەکەش لە دەرەوەی ناوکە و لەناو شلەی خانەکەدا و لە ماددەیەکی هاوشێوە دروست کراوە کە RNAـە، ترشی ڕایبۆنیوکلییەک. ئیدی کۆپییە نوێیەکان لەسەر وێنەکە دروست دەکات و بنەڕەتەکەش لە ئەرشیفی ناو ناوکدا دەپارێزێت.

ئەوەشی زۆر لە ڤایرۆسدا سەرسامکەرە، ئەوەیە کە هەمیشە لەم دوو ماددەیە پێک دێت، هەندێک جار لە یەکێکیان بەبێ ئەوی دی و هەندێک جاریش هەردووکیان پێکەوە. هەندێک جار شێوەیان کۆمەڵێک بلووری بێگەردە و هەندێک جاریش پێکهاتەیەکی ئەندازەیی بلووری بە کۆمەڵێک لقوپۆپی وەکوو ئالیەری تەلەڤزیۆنەوە و، هەندێک جاریش ئەو بلوورانە بە کیسێکی چەوری یاخود پرۆتین دەورە دراون. وەلێ لە هەموو حاڵەتەکاندا تەنها ماددەیەکی کیمیایی مردووە، نە جەستەیەکی خانەیی و نە بوونێکی زیندووی هەیە. دراکۆلایەکی مردووە لە تابووتەکەیدا. بەڵام، هەر ئەوەندە ئەم دراکۆلا مردووە بەو لقوپۆپ و کەڵبانەیەوە بەر خانەیەکی زیندوو کەوت، ئیدی دەگۆڕێت بۆ شەیتانێکی تۆقێنەر. یەکەمین کارێکیش دراکۆلای تۆقێنەر دەیکات کاتێک بەر خانەی زیندوو

دەکەوێت، ئەوەیە کە DNAـەکەی خۆی دەکاتە نێو خانە زیندووەکەوە، بەم جۆرە دەچێتە ناو خانەکەوە و بەرگ و بەشە زیادەکانی لەشیش لە دەرەوەی خانە جێ دەهێڵێت.هەر کە چووشە ژوورەوە، ئیدی خانەکە سەری لێ دەشێوێت.بۆ یەکەم جار ڕووبەڕووی کۆدێکی کیمیایی نوێ دەبێتەوە، کۆدێکی فەرمانکەر، کە ڕێنمایی کیمیایی جیاواز لە ڕێنماییەکانی هەموو ڕۆژێکی پێیە. بە درێژایی چەند خولەکێکی کەم خانەکە وا تێدەگات کە ئەم فەرمانە کیمیاییانە لە ناوکەکەی خۆیەوە دەر دەچن، بۆیە دەست دەکات بە جێبەجێکردنیان و دەست دەکات بە کۆپیکردنی هەزاران کۆپی لەو میوانە نوێیە و لە چەند ساتێکدا دراکۆلا دەبێتە هەزار دراکۆلا. جەستە زیندووەکەی بۆ پلانە جەهەنەمییەکەی خۆی ڕام کرد، ئێستا ئیدی خانەکە دەبێت خێراخێرا زیاد بکات نەک بەپێی پلانی تایبەتیی خۆی و کۆدە سروشتییەکەی، بەڵکوو بەپێی پلانی ئەو و کۆدی ئەو. لەسەریەتی ملیۆنێک کۆپی لە دراکۆلا دروست بکات.

تازە دراکۆلا تامی خوێنی کرد.ئیدی ئەو مردووە بێگیانە دەگۆڕێت بۆ زیندوو و ڕوحلەبەر.

ئەو خانە نەخۆشەش کە بەم ڕێگایە زیاد دەکات، ئەوەندەی پێ ناچێت دەتەقێتەوە و بە هەزارەها یەکەی ڤایرۆسی لێوە دەر دەچێت تا دواتر خانەی تر و خانەی تر دروست بکات. دەست دەکات بە توانەوە و لەناوچوون، لەولاشەوە ڤایرۆسەکە دەگۆڕێت بۆ لەشکرێک و لە تاریکیدا دەستی خۆی دەوەشێنێت.

هەندێک جاریش، ئەو جیاوازییە کەمەی کۆدی کیمیایی دەبێتە هۆی گەشەکردنی خانەی شێرپەنجەیی. جا ئەگەر جەستە لە کاتی گونجاودا ئاگاداری ئەم فێڵە بوو، دەست دەکات بە دەردانی ماددەی دژ و

دەست دەکات بە ناردنی ڕێنمایی کیمیایی نوێ و زۆربوونی خانەکەی پێ دەگەڕێنێتەوە سەر پلانە ئاساییەکەی خۆی، ئیدی لەبەرامبەر ئەم بەئاگاهاتنەوە کتوپڕەدا دراکۆلا فریای گەڕانەوە بۆ نێو تابووتەکەی خۆی ناکەوێت، هەر وەکوو لەژێر وردبیندا دەبینرێت، دەبێتەوە تەنها کۆمەڵێک بلووری مردووی وەکوو خوێی چێشت و نە ژیانی تێدایە و نە جووڵەیەک، نە هەناسە و نە زۆربوون و نە هەست.

نهێنیی ئەو مردووە زیندووە چییە؟!

چۆن ژیان ئاوا لە ماددەیەکی بێژیاندا ترپە ترپییەتی؟!

شتەکان خەریکە تێکەڵ دەبن و چیدی ئەو بەربەستە پتەوەی نێوان ژیان و ناژیان نەماوە، ئێستا ئیدی ئەوەتا لە ماددە مردووەکاندا ژیان دەدۆزینەوە.

مەتەڵێک لە گەورەترین ئەو مەتەڵانەی ئێستا ڕووبەڕووی زانایانی بایەلۆجی دەبێتەوە.

مەتەڵێک بە ناوی ڤایرۆس.

منیش ناوی دەنێم دراکۆلا.

**ڕووەك بۆمبە ناوەكییەكەی خۆی ئاشكرا كرد**

ئەو كێشەیەی ئەمڕۆ ڕووبەڕووی تۆ دەبێتەوە، هەمان ئەو كێشەیەیە كە سێ هەزار ملیۆن ساڵ پێش ئێستا ڕووبەڕووی یەكەم بوونەوەری زیندوو بوویەوە. ئەویش خۆراكە. دابینكردنی قووتی ڕۆژ. ئێمە بۆ ئەوە ناخۆین چوونكە برسیمانە. برسێتی تەنها دروشمێكە؛ تەنها هۆشدارییەكی دەمارییە كە سك بەتاڵ بووەتە و شەكری خوێن لە دابەزیندایە. لای یەكەم بوونەوەری زیندووش (كە تەنها میكرۆبێكی تاكەخانە بوو) دەزگایەكی دەماری بوونی نەبوو تا هەستی برسێتی و هەستی بەتاڵبوونەوەی سكی پێ بدات، ئەو سكی هەر نەبوو. بەڵام خۆراكی دەخوارد، هەر وەك چۆن ئێمە ئێستا دەخۆین، لەبەر هۆكارێكی قووڵتر لە برسێتی، هۆكارێك زیاتر پەیوەستە بە ژیانەوە، وەك لەوەی تەنها ئارەزووی خۆراك بێت.جا بۆ ئەوەی هۆكارەكە بزانین، سەرەتا پێویستە بزانین ژیان چییە؟

بە زمانی كیمیایی، ژیان بریتییە لە كۆمەڵێك كارلێك. لێكردنەوە و پێكهێنان و شیكردنەوە و دروستكردنی ماددەگەلی كیمیایی، كە بوونەوەری زیندوو لە ژینگەكەیەوە وەری دەگرێت و سەرلەنوێ لەسەر شێوەی خۆی دروستی دەكاتەوە. ڕووەك خوێیەكان و ئاو و گڵ لە ژینگەكەیەوە وەر دەگرێت و لەسەر شێوەی خۆی ڕێكیان دەخات، ئیدی دەیانكاتە لقوپۆپ و گوڵ و بەروبوم.

بوونەوەری زیندوو كارگەیەكی كیمیایی جووڵاوە، لە حاڵێكی ئاڵوگۆڕی بەردەوامدایە لەگەڵ ژینگەی دەوروبەری، كاری لێ دەكات و كاری تێ دەكات و ڕووبەڕووی دەبێتەوە و پارێزگاری لە كەسایەتی و قەوارەی خۆی دەكات، سەرەڕای ئەو بارودۆخە گۆڕاوانەی بەبەردەوامی هەوڵی گۆڕینی دەدەن.

ئیدی لەمیانەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم بارودۆخە پشێوەدا کە ڕێکەوت و ڕووداوە هەڕەمەکییەکان حوکمی دەکەن، بوونەوەری زیندوو بەوە جیا دەکرێتەوە کە تەرزێکی دانسقەیە و خاوەنی نەخشەی خۆیەتی و یاسای خۆی هەیە و ویستێک هەیە خۆکردانە ئاڕاستەی دەکەن بۆ پاراستنی جۆرەکەی. جووڵەی ئەو وەکوو جووڵەی پووشێک نییە بەسەر ئاوەوە هەرچۆنێک ڕێک کەوت و هەرچۆنێک تەوژمەکە پاڵی نا، بەڵکوو ئەو بە هاندەرێکی ناوەکی دەجووڵێت، بە میزاجی خۆی. ئەو بە پێچەوانەی تەوژمەکەوە دەجووڵێت. ئەوەتا لە ڕووەکدا بە پێچەوانەی تەوژمەکەوە سەر دەکەوێت و لە باڵندەکاندا بە ئاسماندا دەفڕێت و لە ماسییەکاندا نغرۆی ئاو دەبێت، لە کاتێکدا هەمیشە لەگەڵ یاسایەکەی خۆیدا، نە هیچ یاسایەکی دی، ڕێک دەکەوێت و لە کاتێکدا هەموو شتێک لە چواردەوری ئەو لەناو دەچێت و دادەخورێت، ئەو گەشە دەکات و زیاد دەکات و قەدەکەی پتەو دەکات و سیفەتە باشترینەکانی دەگوازێتەوە بۆ نەوەکانی پاش خۆی. هەموو ئەم تایبەتمەندییانە پێکەوە بە کۆ ناویان ژیانە.

بە زمانی فەلسەفە زیاتر لە تاکییەتی و ئازادییەک دەچێت لە ناوەڕاستی کوێریی حەتمییەت و ئالیبوونی ماددەدا دەر دەکەوێت، بەڵام ئەم تاکی و ئازادییەی کە بە شێوەیەکی دروستکراو دەر دەکەوێت، ڕێگا و هۆکارە دیارەکەی کە خۆی پێ پیشاندەدات کۆمەڵێک کارلێکی هێورنەبووەوەن ، هەموو جووڵەیەک بەرامبەرەکەی کارلێکێکی کیمیای و کارەبایی تایبەتە کە بووەتە هۆی و هەموو گەشەیەک بەرامبەری کۆمەڵێک پێکهاتەی کارگەیی ئاڵۆزن.

لە ڕاستیدا ئەوەی دەگوزەرێت شتێکە هاوشێوەی سووتانی بەردەوام لە فڕنێکی فرەفەرماندا و وەکوو هەر فڕنێکی دیش پێویستی

بە سووتەمەنییە، چوونکە هەموو کردارێک تێچووی خۆی هەیە. تۆ بۆ ئەوەی ماڵەکەت ڕووناک بکەیتەوە، پێویستت بە کارەبایە و بۆ ئەوەی کارەباش بەرهەم بهێنیت، پێویستت بە هێزێکی هەڵمییە و بۆ ئەوەشی ئەو هێزە هەڵمییە بەدەست بهێنیت، بێگومان پێویستت بە کۆمەڵێک تۆربینە بخولێتەوە، تا ئەم تۆربینانەش بخولێنەوە، پێویستت بە هێزێکی هەڵمییە و بۆ ئەو هێزە هەڵمییەش تۆ دەبێت خەڵووز بسوتێنیت. هەموو ئەمانە پێکەوە شێوەیەکن لە شێوەکانی وزە و هەریەکەیان دەبنە ئەوی تریان.لە کۆتاییشدا هەر دەبێت خەڵووز بسووتێنین. هەر دەبێت سووتەمەنیمان هەبێت تا ئەم پرۆسانە بەڕێوە بچن و بە هەمان شێوە دەبێت خۆراکیش هەبێت.ژیان پێویستی بە خۆراکە، سەرەتا بۆ ئەوەی وزە بەرهەم بهێنێت نەک تا سکی پڕ بکات. خانەی یەکەمی بێدەسەڵاتیش هیچێکی لە بەردەمدا نەبوو بیخوات شلەی ئەو زەلکاوانە نەبێت کە مەلەی تێدا دەکردن، هیچ ڕێگایەکیش بۆ بەرهەمهێنانی وزە نەبوو ترشاندنی ئەو شلەیە و شیکردنەوەی بۆ ماددەگەلی کهولیی سادە نەبێت کە وزەیەکی کەم و هیچی لێوە دەر دەچێت و لە ژیانی خۆیدا بەکاری دەهێنا. ملیۆنەها ساڵ تێپەڕی و ژیان لەم سەرچاوە سنووردارەی دەخوارد و وردەوردە ئەو سەرچاوەیەش دەستی کرد بە وشکبوون و لە ئاسۆوە دێوی برسێتی دەر کەوت و بەرەبەرە نزیک دەکەوتەوە و ژیان ئیدی خەریک بوو دەفەوتا. مەرگ ڕۆژانە ژمارەیەکی زۆر خانەی درووێنە دەکرد. ئیدی هەر دەبوو ڕێگایەکی دی بۆ خۆراک و بەرهەمهێنانی وزە و هەڵکردنی فرنییان بۆ بدۆزرێتەوە، ڕێگایەکی دی جگە لەم ترشاندنە سەرەتاییە، بێگومان بە درێژایی ملیۆنەها ساڵ چەندین ئەزموون و تاقیکردنەوەی جێگیر ئەنجام دراوە. وەک چۆن ئێمە دەستمان پێ کرد بە سووتاندنی دار، پاشان

خەڵووزمان دۆزییەوە، پاشان نەوتمان دۆزییەوە و دواتر کارەبامان دۆزییەوە و دواتریش بۆمبی ناوەکی، میکرۆبەکانیش لە پێشبڕکێیاندا لەگەڵ مەرگدا بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەکی کیمیایی دیکەی جیاواز لە ترشاندن بۆ ژیان، خەریکی تاقیکردنەوە بوون.

بێگومان پێکەنیناوییشە خەیاڵ بکەیت میکرۆبێک تاقی دەکاتەوە و هەوڵی داهێنان و دۆزینەوە دەدات، ڕەنگە وێناکردنە زیاتر ئەقڵانییەکە ئەوە بێت کە ئەو خودایەی ئەم خانە سەرەتاییانەی دروست کردووە، ڕێنوێنیی کردوون و لەم ڕێڕەوە سەیرتر لە خەیاڵەدا دەستی گرتوون، ئیدی بە تەدبیر و ڕێنوێنیی ئیلاهی، میکرۆبی بلیمەت توانیی ماددەیەک دروست بکات بە ناوی کلۆرۆفیل.

بەڕاستی کلۆرۆفیلیش ماددەیەکی بلیمەتە، ئەوەندە بەسە تیشکێکی خۆری بەر بکەوێت، ئیدی تەوژمێکی کارەبایی لێوە دەردەپەڕێت، نهێنییەکەشی لەوەدایە کە پێکهاتەی تایبەت و زۆر هونەریی هەیە، بە جۆرێک گەردیلەکانی بە شێوازێک بەیەکەوە بەستراون کە ئەلکترۆنەکانی لە شێوەی هەورێکی تا ڕادەیەک پەرت و ئازاددا کۆ ببنەوە، ئەوسا پاڵنەرێکی بچووکی تیشکی خۆری بەسە تا لە شێوەی تەوژمێکی بەدوایەکداهاتوو ورووژم بکات.

ئێ دوای ئەمە چی؟

وەک چەندین ملیۆن ساڵە بەو شێوازەیە، خۆر بەسەر میکرۆبدا هەڵدێت. بەڵام ئەم جارە شتێکی نوێ ڕوو دەدات، میکرۆبەکە سەدان تۆپی کلۆرۆفیلی سەوزی بۆ خۆی دروست کردووە و ئەم تۆپە سەوزانە تیشکی خۆر هەڵدەمژن و دەیگۆڕن بۆ وزەی کارەبایی و ئیدی ئەو وزە کارەباییە هەموو شتەکانی دی دەکات. ئاو شی دەکاتەوە بۆ ئۆکسجین

و هایدرۆجین. ئۆکسجین دەکاتە هەواوە و هایدرۆجین و دوانەئۆکسیدی کاربۆن (کە لە هەواشدا چەندە زۆرە) دەهێڵێتەوە بۆ دروستکردنی شەکر و نیشاستە.ئەم دۆزینەوەیە، کە ناوی ڕۆشنەپێکهاتنە، بووە دەستپێکی چەرخێکی نوێ لە ژیان بە ناوی چەرخی ڕووەکە سەوزەکان، ئەوانیش ڕووەکگەلێکن خۆراکیان لەسەر تیشکی خۆرە و خەزنکردنی ئەو تیشکەیە لە دەنکگەلێکی تایبەتدا.

بۆ ئەوەی بشزانین ئەم دۆزینەوەیە تا چ مەودایەک ناوازەیە، ئەوەندە بەسە کە بزانین ئامارەکان بڕی ئەو وزەیەی ڕووەک ساڵانە بەم ڕێگایە خەزنی دەکات بە (دە ملیۆن ملیۆن ملیۆن) گرام کالۆری مەزەندە دەکەن، واتە بە نرخی سەد ملیۆن بۆمبی ناوەکی.ئەم دۆزینەوەیە پێش هاتنی مرۆڤ بۆ سەر زەوی ڕووی دا، خانە ڕووەکییەکان لە سەرکەشییە ڕۆژانەکانیاندا بۆ گەڕان بەدوای خۆراکدا دۆزیویانەتەوە، ئەمەش بە ڕێنوێنیی دروستکارەکەیان.

ئەمە تاقە دۆزینەوەش نەبوو، چوونکە ئەوەندەی نەخایاند دۆزینەوەیەکی دی دەر کەوت. خانە، ئۆکسجینی جێماو لە کرداری ڕۆشنەپێکهاتنی هەڵگرتەوە و بۆی دەر کەوت دەکرێت شەکری پێ بسووتێندرێت، کە ئەمەیە ئێستا ڕووەک و هەموو گیاندارەکانی دیش لە کرداری هەناسەداندا پێی هەڵدەستن. ئۆکسجین لە هەواوە وەر دەگرین (کە ئۆکسجینێکە لە ڕووەکەوە هاتووە) و لە جەستەماندا شەکری پێ دەسووتێنین تا وزەیەکی مەزنتر بەدەست بهێنین هاوکارمان بێت بۆ جووڵە و بازدان و مەلەکردن.

چیرۆکەکە هێشتا بەردەوامە و ئەڵقەکانی پێکەوە بەندن، چوونکە ئێمە بەم وزەیەوە کە لە هەناسەدانەوە دەستمان دەکەوێت نەوەستاوین،

بەڵکوو بەڕێگای تایبەتی خۆمان بۆ سەرچاوەی دیکەی وزە دەگەڕێین. تەختەمان سووتاند، پاشان خەڵووز، پاشان نەوت، دواتر هەڵممان بەرەڵا کرد و کارەبامان بەرهەم هێنا و گەردیلەمان تەقاندەوە و شتی دیکەش بەڕێگاوەیە.فەزڵی هەموو ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ خانەیەکی ڕووەکیی بلیمەت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان، پێش ملیۆنەها ساڵ، بۆمبی کلۆرۆفیلی بە ڕێنوێنیی خودایی دۆزییەوە.

هەمیشە بیرت بێ بەڕێزەوە تەماشای درەختەکانی سەر ڕێگاکان بکەیت، چوونکە ئەوانن هەموو ڕۆژێک ئۆکسجینت پێ دەبەخشن تا هەناسە بدەیت. کاتێک دەربارەی سەیروسەمەرەکانی جیهانی ڕووەک دەخوێنیتەوە، کە چۆن جۆریان هەیە دڕندەیە و پێش ئەوەی گیانلەبەرێک بیخوات ئەو ئەو دەخوات و، ڕووەکی کەڕوویی هەیە و، ڕووەکمان هەیە تۆوەکەی باڵدارە و وەکوو پەڕەشووت دەفڕێت و ڕووەکمان هەیە هەست بە دەستلێدانی دەکات، سەرت نەسووڕمێ، چوونکە ئەوەتا شتی لە هەموو ئەمانە سەیرترت زانی.

چیرۆکی ڕووەکێکی داهێنەرت زانی کە بۆمبە ناوەکییەکەی خۆی داهێنا.



## خـــاوەن شـــکۆ

سێ سەد ملیۆن ساڵ پێش ئێستا، پێش ئەوەی شتێک بە ناوی مرۆڤ بێتە سەر زەوی و ئەو کاتەی زەوی هێشتا عازەب بوو، کێڵگەیەک بوو هیچ گاسنێک نەیکێڵابوو، ژیان نەوەیەکی نوێی لەشناسکی بوو بە ناوی «مێروو.»

قەدەری ئەم نەوەیە وا بوو کە وەچەی پڕفەڕی یەکێک بێت لە هەمەجۆرترین پۆلەکانی ڕوحلەبەران لە ڕووی ژمارە و چەشنەوە. لە دەیناسۆڕی مەزن زیرەکتر بێت و لە ڕێوی شاخ فێڵبازتر بێت و لە دڕەندەی جەنگڵستان بەتواناتر بێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوە.

کاتێک بەستەڵەکەکان خشان و زەوییان داپۆشی لە چاخی بەفریندا و لە دەوروبەری زەریاکان، دەیناسۆڕە مەزنەکان مردن و خشۆکە زۆروزەبەنەکان یەک لەدوای یەک لەناو چوون. مێرووەکان مانەوە و ڕووبەڕوو بوونەوە، بەکۆمەڵیی لەنێو ئەو سەهۆڵەدا و لە مانەوەیەکی زستانی درێژدا چاویان نوقاند و نە خواردیان و نە هەناسەیان دا.ئیدی ڕۆژێک خۆر هەڵهات تا زەوی گەرم بکاتەوە و بەستەڵەک توایەوە. بە هەزاران و ملیۆنان مێروو لە خەندەقەکانیان هەر وەک یەئجوج و مەئجوج هاتنە دەرەوە، تا ئاو و وشکانی و بیابان و هەوا تاڵان بکەن و هەندێکیان هەندێکی تریان بخۆن و بەشێکیان دزە بکەنە سەر

ڕووەک و ئاژەڵان و هەندێکی تریان لەسەر گڵ خۆراک بخۆن و هەندێکیشییان تەپاڵە،مێرووەکان هەندێکیان لەسەر خوێی زەلکاوەکان دەژین و هەندێکیشیان خوێن دەمژن. ئیدی توانای گونجانیان لەگەڵ هەر خۆراکێکدا کە هەبێت هەیە. ئەمڕۆش لەنێوماندا مێرووی سەیر هەیە جۆری سەیری خۆراک دەخوات، بۆ نموونە مێشی پترۆل کە لە حەوزەکانی پترۆڵدا دەژی، مێشی مۆمیا لەسەر ئەو خوێیانە دەژی کە بۆ مۆمیاکردنی جەستە بەکار دێن و، قالۆنچەی تەلی کارەبایی لەسەر وایەری قورقوشمی دەژی. کوللەی سەرچاوە کبریتییە گەرمەکان و ئەو خاڵخاڵۆکە ڕەشانەی ئێسک دەخۆن.

هەموو مێروویەکیش وەکوو ئوتومبێلێکی زرێپۆش دەجووڵێت کە چەند قاتێک لە ماددەیەکی ڕەقی وەکوو کیتین چواردەوری لاشە ناسکەکەی داوە و ڕووبەڕووی هەموو لەناوبەرە کیمیاییاکان دەبێتەوە. هەر وەک خۆی بە کۆمەڵێک تیر و خەنجەر و دڕک پڕچەک دەکات کە دەرزییەکی پێوەیە (چزوو)، هەر دوژمنێک لێی نزیک ببێتەوە پێوەی دەدات و ئیفلیجی دەکات و دەیخوات. بڕێکی تریان ڕەنگی خۆیان دەخەنە سەر ڕەنگی ژینگەکەیان وەکوو ئەوانەی سەوزن خۆیان سەوزپۆش دەکەن و کوللەی زەرد ڕەنگی گڵ لە خۆی دەنێت. بڕێکی تریان گەڵای مردووی درەختەکان دەکەن بە خۆیانەوە و بە زەوییەکەدا دەخشێن.هەندێکی تریان گازی بۆن ناخۆش بڵاو دەکەنەوە تا دوژمنەکانیان ڕاوبنێن و هەندێکیان چاڵ بۆ خۆیان هەڵدەکەنن تا خۆیانی تیادا حەشار بدەن و هەیانە قەڵای پارێزراو لە گڵ بۆ خۆی دروست دەکات و هەشە لە شێوەدا دەچێتەوە سەر زەردەواڵە پێوەدەرەکان بەبێ ئەوەی یەک چزووی پێوە بێت، بەمەش دوژمنەکانی هەڵدەخەڵەتێنێت.

مێرووەکان بەرگەی پلەی سەرما هەرە زۆر نزمەکانی ژێر سفر دەگرن، دەیبەستن و نامرن، هەر وەک بەرگەی پلەی گەرمیی زۆر بەرزیش دەگرن، لەژێر پەستانی هەوای نزم و لەژێر پەستانی بەرزی ژێر دەریاکانیشدا دەژین، لە بۆشاییدا، لە نەبوونی ئۆکسجیندا و لە بوونی گازە ژەهراوییەکانیشدا هەر دەژین. هەر مێروویەکیش لە زیاتر لە ژینگەیەکدا دەژی، مێشوولە لە قۆناغی کرمی و قۆزاخەییدا لە زەلکاوەکاندا دەژی و لە قۆناغی مێرووبی تەواوەتیشدا لە باخچەکاندا دەژی و نێرەکانی لەسەر گوڵەکان خۆراک دەخۆن و مێیەکانیش لەسەر خوێنی مرۆڤ.

مێرووەکان گوێبیست دەبن و هەست دەکەن و بۆن دەکەن و دەبینن، هەندێک جار لە ڕێگەی شاخی هەستکردن یاخود دەرزیی بچووک و لاوازەوە لەسەر لاشەیان و، هەندێکیشیان پەردەی گوێیان هەیە، هەندێکیشیان چاوی زیادەیان هەیە.

ئەو پەرجووەش کە بە هۆیەوە مێرووەکان توانییان مەرگ و لەنێوچوون و بارودۆخی سەخت ببەزێنن، پەرجووی وەچەیە. مێرووی کرمی لۆکە بە یەک جار ٤٠٠ هێلکە دادەنێت، ٢٨٠ مێ و ٢٠٠ نێر هەڵدێنێت و هەریەک لەو مێیانەش ٤٠٠ هێلکەی تر دەکات، ئیدی بە تۆزێک ژمارکاری بۆت دەر دەکەوێت کە بەم شێوازە مێروو هەشتا هەزار و پاشان ١٦ ملیۆن هێند دەبێت. هەموو ئەمە لە تاقە مێروویەکەوە و لە ماوەیەکدا کە بە چەند ڕۆژێک مەزەندە دەکرێت.

مێشی درۆسۆفیرا بۆ نموونە، لە ساڵێکدا ٢٥ نەوە دەخاتەوە، نەوەی یەکەم بە ١٠٠ هێلکە دەست پێ دەکات و بە ژمارکارییەکی سادە ڕوون دەبێتەوە کە ژمارەی کۆتایی لە نەوەی بیستوپێنجەمدا لە

قەبەییدا دەگاتە ئاستێک کە ئەگەر بخرێنە پاڵ یەک، پردێک دروست دەکات لە زەوییەوە دەگاتە خۆر.

یەکێکی دییش لە سەیرترین ئەو شتانەی لە مێرووودا هەیە (مەعریفەی غەریزییە)، بۆ نموونە جۆرە مێروویەکمان هەیە گەڵای کەلەرم هەڵدەبژێرێت تا هێلکەی لەسەر بکات، لە کاتێکدا خۆراکی ئەو لەسەر کەلەرم نییە و نایخوات و پێویستیشی پێی نییە، بەڵام مەعریفەیەکی غەریزیی ناوەکی پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەو کارە، چوونکە کە هێلکەکان تروکان، ئەو کرمە بچووکانەی لێوە دەر دەچن بەتەنها کەلەرم دەخۆن، بۆیە دەبێت ئەو مێرووە لەسەر کەلەرم هێلکەکان دابنێت تا دواتر بەچکەکانی شتێک هەبێت بیخۆن، هەموو ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو مێرووە ئەم بابەتە وەکوو زانینێکی ئەقڵی و هۆشیاری نازانێت. تەنانەت ئەگەر ئەو بێچووانەش ببینێت کە لە هێلکەی خۆیەوە هەڵی هێناون، نایانناسێت و نازانێت ئەم کرمانە رۆڵەی ئەون. کۆی پرۆسەکە بەبێئاگایی و بە پاڵنەری هێزێکی نادیار کە ناوی غەریزەیە بەڕێوە دەچێت. زەردەواڵەی گڵ کرمێک ڕاو دەکات و یەک هێلکەی لەسەر دەکات و دەیخاتە نێو لانەکەیەوە و خۆی دەچێت بەدوای وردە بەرددا دەگەڕێت، کە دۆزینیەوە دەیانخاتە نێو قوڵەکانیەوە و دەرگای لانەکەی پێ دادەخات. ئیدی کە هێلکەکەی هەڵهێنا، بێچووی بچووک خۆراکەکەی لەنێو دەستیدا ئامادەیە.زەردەواڵە چۆن ئەم پێویستییە پێشوەختەی زانی و خەمی لێ خوارد؟!

ئەی ئەو مێشوولەیەی هێلکەکانی لەسەر ڕووی ئاو دادەنێت و دوو کیسە هەوا دەکات بە هەر هێلکەیەکەوە تا بە هۆیانەوە سەر ئاوەکە بکەون، ئاخۆ یاساکانی ئەرخەمیدس پێبزانێت؟

ئەو مێرووەی لە زانستی مێرووزانیدا پێی دەڵێن (بۆمبهاوێژ)، بێ ترس و بە ئارەزووی خۆی بە بەردەمی ئاژەڵە دڕندەکاندا دێت و دەچێت و هەر ئەوەندە یەکێکیان دەمی کردەوە تا بیخوات، ئەو فشار دەخاتە سەر کیسێک لە سکیدا، ئیدی لە ساتێکدا دەردراوی سێ ڕژێن تێکەڵ دەبن کە پێک هاتوون لە ماددەی هایدرۆکینۆن و سەروو ئۆکسیدی هایدرۆجین و ئەنزیمێکی تایبەت، تێکەڵبوونی ئەم سیانەش دەبێتە هۆی کارلێکێکی توند و دەردانی گازێکی پیوەدەری بۆنناخۆش، بە جۆرێک ئاژەڵی دڕندە دەتۆقێت و هەڵدێت.ئایا ئەم مێرووە دبلۆمی کیمیای لە زانکۆی کامبردج وەر گرتووە؟!

مێرووگەلێک لە دەزووی حەریر داو دەنێنەوە و هەندێک لە شەواندا دەدرەوشێنەوە تا مێشوولە بۆ خۆیان کێش بکەن و بیخۆن، مێرووگەلێک لە ئاودا مەلە دەکەن و دەستەکانیان وەکوو سەوڵ بەکار دەهێنن و بە دەستی باڵدار بە هەوادا دەفڕن و مێرووشمان هەیە گۆرانی دەچڕێت تا بانگ لە نێرەکەی بکات.

بێ شک ئەقڵێک هەیە دروستکراوەکانی دروست کردووە و پلانی بۆ داناون و شتانێک لە غەیب و نادیار دەزانێت کە کەسی دی نایانزانێت.

ئەم گفتولفتە درێژە دەکێشێت و تا دێت خۆش دەبێت.

هەرچەندیش زیاتر لە بابەتەکە ڕۆ بچین، سەیروسەمەرەتر دەبێت.



## لە بەردەم ماڵی مێرووڵەدا

بەڕاستی وەستان و تێڕامانێک لە مێرووڵەیەکی بچووک سەری مرۆڤ دەسووڕمێنێت.

ئەم مێرووڵەیە چلۆن فێر بووە بەم جۆرە ئەو ماڵە ئەندازەییە ئاڵۆزە خودان ڕاڕەو و ژوورە، خودان ژێرزەمین و مەخزەنە دروست بکات؟چۆن لە کۆمەڵگایەکدا کە دابەشکردنێکی زۆر وردی پسپۆڕی و فەرمانەکانی تێدا دەگوزەرێت خۆیان ڕێک خستووە؟چۆن فێری چاندن بوون (هەندێک جۆری مێرووڵە قارچک دەڕوێنن!) چۆن فێر بوون مێروویەکی تری وەکوو سن بدۆشن و بەڕیز پێش خۆیانی بخەن و لێیان بخورن؟

پەیوەندیکردنی ئەم ژمارە بێشومارەی مێرووڵە بەیەکەوە لە کۆمەڵگایەکی پڕ لە یاسادا، مانای ئەوەیە کە لەنێو خۆیاندا جۆرێک لە زمان و لێکتێگەیشتنیان دۆزیوەتەوە. دوایین توێژینەوەکانیش لەم بوارەدا دەڵێن کە لێکتێگەیشتنی مێرووڵەکان لەنێو خۆیاندا بە زمانی ئاماژە و بە زمانی-گوتراویش نییە، بەڵکوو زمانیان زمانی کیمیاییە.

ئەگەر بێت و چاودێریی لانەی مێرووڵە بکەیت، بەیناوبەینێک دوو مێرووڵە دەبینیت دەگەن بەیەک و شتێکی هاوشێوەی ماچ و چرپەچرپ

لەگەڵ یەکدا دەگۆڕنەوە. لە ڕاستییشدا ئەوە نە ماچە و نە ورتەورت، بەڵکوو ئەوە هەریەکێکیان لیکێک دەر دەداتە دەمی ئەوی دیکەیانەوە کە هەڵگری هێمایەکی کیمیاییە و واتای ئەوە دەگەیەنێت کە با ئاوها و ئاوها بکەین.

بە هەمان شێوە کاتێک مێرووڵەی کارگوزار ئەو هێلکەیە وەردەگرێت کە شاژن دەیکات تا چاودێریی بکات، هێلکەکە بە ماددەیەکی کیمیایی تایبەت، کە ڕژێنەکانی شاژن دەریان داوە، بۆیە کراوە. ئیدی کە مێرووڵەی کارگوزار ئەم هێلکەیەی لێسایەوە، وەکوو ئەوە وایە نامەیەکی هێمایی پێ گەیشتبێت کە هەڵگری هەموو ڕێنماییەکی تایبەت بە چاودێریکردنی ئەو هێلکەیەی تێدا بێت.

ئەمەیە ڕاڤەی ئەو دەردراوە کیمیاییە خێراگۆڕاوانەی هەر ساتناساتێک مێرووڵە دەری دەدات، هەر دەڵێیت لەناو سکیدا چاپخانەیەک هەیە بە زمانی کیمیا و هێمای کارلێکەکان چاپکراوی بێشوومار چاپ دەکات، ئەمە ئەوەش ناگەیەنێت کە مێرووڵە لاڵە و قسە ناکات، چوونکە هەندێک هۆزی مێرووڵە هەن دەنگ دەر دەکەن و قسە دەکەن و هاوار دەکەن، بە دەنگی زۆر تیژ و نزم و، هۆکاری خۆیان بۆ گفتوگۆی بیستراو هەیە.

شتێکی دییش لە مێرووڵەدا هەیە ناتوانین ناوی بنێین ئەقڵ، بەڵکوو شتێکە لە بینایی.

ئەوەی کە مێرووڵە هەڵبسێت بە کۆکردنەوەی خۆراک و دەنکەدانەوێڵە و وردەنان و پاشماوەکان و پاسەوانییان لێ بکات و ئێشکگرییان لێ بکات و لەو شتانەی دەیانگۆڕن و خراپیان دەکەن پارێزگارییان لێ بکات، هەموو ئەمانەش وەکوو ئامادەکارییەک بۆ وەرزی زستان کە هێشتا

نەهاتووە و بەبێ ئەوەی مێرووله توانای ئەقڵی و خەیاڵی وێناکردنی داهاتوو و بارودۆخ و پێداویستییەکانی داهاتووی هەبێت! ئەمە چۆن چۆنی؟!

ئەوەی کە مێرووله ئەو گەڵا گونجاوانە هەڵدەبژێرێت کە بۆ پەیینکردنی قارچکە چاندراوەکانی دەگونجێن. چەرم و پێستی ئەو کرم و مێروانەی ڕاویان دەکات لێیکاتەوە تا خوانێکی بەلەزەتی بۆ بێچووەکانی نێو خانەکەی لێ ئامادە بکات. ئەوەی کە مێرووله سن ختووکە بدات و بەناسکی دەست بهێنێت بە سکیدا تا بەرەزامەندییەوە شیرەکەی لێ دەر بهێنێت و بیدۆشێت. ئەوەی کە مێرووله هێرش بکاتە سەر مێروویەکی چەندین جار لە خۆی گەورەتر و بەدزەدزە باز بداتە سەر پشتی و لە ملیەوە بە دوو دەستی وەکوو کەلەپچە بیگرێت و ماددەیەکی سڕکەر بڕژێنێتە نێو سەنتەرە دەمارییەکانی مێشکی و ئیدی تووشی ئیفلیجیی بکات، هەموو ئەمانە بە چەند ساتێکی کەم ئەنجام بدات و ئینجا وەکوو نێچیرێکی ئاسان-بەدەستەوەهاتوو ڕای بکێشێتە نێو لانەکەی.ئەم مێروولەیە چۆنها جێگای ئەو سەنتەرە دەمارییانەی زانی؟!

هەمیشە کارە ڕاستەکان لە کاتی گونجاودا ئەنجام دەدەن!

لەمانەش سەیرتر ئەوەیە لەنێو جۆرەکانی مێروولەدا، شێوازی سلوکی و ئەخلاقی جیاواز بوونی هەبێت. بۆ نموونە جۆرمان هەیە لە مێرووله هەلقۆزەرەوە و بەکارهێنەرە، داگیرکارە، سەرمایەدارییە، پەلاماری لانەی مێروولەی دیکە دەدات و گەمارۆی دەدات، سەرگەورەکان بە کوشتن و سەربڕین لەناو دەبات و کۆگاکان بە تاڵان دەبات و ئەوەی سووک بێت و هەڵبگیرێت و بەهای زۆر بێ و شتی چاک بێت لە

خۆراک، لەگەڵ خۆیدا دەبات.هێلکەکان دەڕفێنێت تا دواتر چاودێرییان بکات و هەڵیان بهێنێت، بێچووەکان بەخێو بکات تا بیانکاتە خزمەتکار و بەندە و کەنیزەک و خزمەتکاری خۆی.

کێ ئەم شێوازە ڕەفتارییە قۆزەرەوەیەی فێری مێروولە کردووە؟

بێ شک ئینگلتەرا نییە، ئەمریکاش نییە، ئەگەرچی ئەم مێروولەیە لە ئینگلتەرا و ناوچەی قەڵەمڕەوی ئەمریکی بوونی هەیە.

هەروەها بێتەوە مێروولەی ئەندازیار، مێروولەی کیمیاگەر کە تەختە دەهاڕێت و دەیگۆڕێت بۆ جۆرێک لە کاغەزی پتەو (ڕێک وەکوو کارگەی ڕاکتا بۆ دروستکردنی کاغەز)، تا لانەی خۆی لە تەرزێکی ئەندازەیی هاوشێوەی سیریالیزم پێ دروست بکات.

هەر بەم بۆنەیەوە نابێت مێرووی تەرمیتی ئەفریقی لەیاد بکەین کە لانەی هاوشێوەی گوومەت و کۆڵەکە و منارە و هێندێک جاریش هاوشێوەی گردی بچووک دروست دەکات و بە ڕێگاگەلێکی نادیار ئەم مێرووە ئەندازیارە ڕاڕەو و کەناڵ و دەرچەی تایبەت بۆ لانەکەی دروست دەکات کە لە ڕێیانەوە هەوای گەرم سەر دەکەوێت بۆ سەرەوە و هەوای سار جێگەی دەگرێتەوە، زۆر بەڕێکوپێکی، بەمەش جۆرێک لە هەواگۆڕکێ و گونجاندنی کەشی بەردەوام بۆ خۆی فەراهەم دەکات.

کارکردن لە خانەی تەرمیتدا دابەش دەبێت بۆ چینی پاشا و شاژن و شازادەکان و سەربازەکان و ئەفسەران، کە ئەمەی کۆتاییان چینێکی تا ڕادەیەک بێکارە و چینی پرۆلیتاریا (کارگوزاران) هەڵدەستن بە دابینکردنی خۆشترین خواردنەکان بۆیان و چاودێریکردنی ڕۆڵەکانیان و پاککردنەوەی خانەکە و گسکدانی هەموو ڕۆژێک و چوونەدەرەوە

بۆ ڕاوکردن و هانینی خۆراک بەڕێکوپێکی و دوور لە هیچ سکاڵا و بۆڵەبۆڵکردنێک. لە هەریەکێک لەم خانانەشدا دەوروبەری ملیۆنێک مێروو نیشتەجێن.

لەپاڵ ئەم کۆمەڵگایانەدا کۆمەڵگای دیکەی هاریکاری لەنێو مێرووولەکاندا هەیە. بڕێک جاریش تاقە مێروولەیەک دەبینین کە ژیانی گۆشەگیری و تەنهایی نێو چۆڵەوانی پێ خۆشترە، بە جۆرێک هەر مێروولەیەک لە خانەیەکی بچووکی تایبەت بە خۆیدا دەژی.

لەمەش زیاتر، تەرزێکی دیکەی سەیر لە مێروولە هەیە لەسەر بەنێچیرگرتنی مێرووی سن دەژی. شەوانی بە ڕاوکردن بەسەر دەبات و هەموو ڕۆژێک لە لانەیەکی نوێدا دەمێنێتەوە کە بەتایبەت لە گەڵای ڕووەکێک دروستی دەکات و هەر ڕۆژە دەچێتە لانەیەکەوە. ئیدی ژیانی عازەبی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و ڕقی لە جێگیری و سەقامگیرییە لە دۆخێکدا.

وەلحاڵ، تیا ئەمێنین گەر لە خۆمان پرسی: چۆن؟ بۆچی؟ مانای چییە کە...؟ کێ ئەم ڕەفتارانەی فێری ئەم مێرووانە کردووە؟ ئایا خۆیان ئەقڵیان بەوە دەشکێت کە دەیکەن؟ ئەگەر نا، کەواتە بۆچی جووڵەکانیان ئاوا لۆجیکی و پێویست و گونجاو دەردەکەون و کاری لەوە ژیرانەتر هەر نابێت؟ ئەگەریش ئەو کارانە بەغەریزە ئەنجام دەدەن، ئەوسا ئەوە کێیە ئەو غەریزەیەی پێ داون، سروشت؟ خودا؟ ئەدی خودا چۆن فێری دەستدرێژی و دزی و کوشتن و داگیرکاری و بەبەردەکردنی ئەوانی دییان دەکات؟ ئەی ئایا سروشتە؟ سروشت چۆن دەتوانێت ئیلهامی ڕەفتار یا شێوازێک بە بوونەوەرێکی زیندوو ببەخشێت. ئایا سروشت ئەقڵە؟ ئایا ئەقڵێکی گشتگیرە؟ ئەگەر ئەقڵێکی

گشتگیرە، کەواتە ئێمەش هاوبەشین لەوەدا، کەواتە وەک چۆن ئیلهام دەبەخشێتە مێرووڕیەک، ئاوا دەیبەخشێتە ئێمەش. بەڵام سروشت بومەلەرزە و گڕکان و هەورەبروسکە و وێرانکاری و داڕووخانیش دەگرێتەوە، ئەی کوا ئەقڵ لەمانەدا؟

هەزار و یەک پرسیار... تیامان ئەقڵ هان دەدات بۆ تێڕامان و بەکارخستنی ئەقڵ و مەتەڵەکە خرۆشەرتر دەبێت.



## ئەو زمانەی هەنگ قسەی پێ دەکات

ئەو مێرووانەی ئەمڕۆ دەیانبینین بچووک و ورد و لاوازن، وەختی خۆی و کاتی هاتنەدنیایان حاڵێکی تریان هەبووە.

پێش ۳۰۰ ملیۆن ساڵ، درێژیی سیسرک نیومەتر بوو، هەزارپێی جوان و ناسک کە ئێستا دەیبینیت بەسەر سەرچاوەکانی ئاودا دەفڕێت، جاران درێژییەکەی نزیکی مەترێک بووە و گیزەگیزی فڕینی لە دووریی چەند کیلۆمەترێکەوە بیستراوە، وەک بڵێیت دەنگی بزوێنەری فڕۆکەیەکی گەورەیە. بەڵام ململانێی مانەوە تەنها وەچە بچووکەکانی ئەم مێرووانەی هێشتەوە، چوونکە ئەوانەیان توانییان لە قووتدان دەرباز ببن و ئەوان بەتواناتر بوون بۆ ڕۆژووی درێژخایەن و خۆحەشاردان و گونجان لەگەڵ بارودۆخە گۆڕاوەکاندا.لە هەمووانیش بەتواناتر بێگومان ئەو بچووکە لاوازە بوو کە ناوی هەنگە. قەت تەماشایەکی شانەی هەنگت کردووە؟ بەڕاستی تەماشاکردنێکە شایانی ئەوەیە خۆتی بۆ بخەیتە مەترسییەوە. لە بەردەرگا چاوت بە پاسەوانانی چەک-دڕکاوی دەکەوێت، ئەوەشی پێوەدانی چزووی هەنگی تاقی کردبێتەوە دەزانێت ئەوە چ چەکێکە هەنگ نیشتمانی خۆی پێ دەپارێزێت. ئینجا ژمارەیەک هەنگ دەبینیت هیچ کارێکیان نییە، ئەوە نەبێت باڵەکانیان بەبەردەوامی بکێشن بەیەکدا تا هەوای پاک

بۆ ژوورەوە پاڵ بنێن و هەواکە نوێ بکەنەوە. هەنگاوێکی تر بچیتە ژوورەوە ڕەنگە مشکێکی تۆپیو ببینیت کە بووەتە قوربانیی ئەو حەزەی بۆ هەنگوین کە نەیتوانیوە کۆنترۆڵی بکات، ئەوێ ئیدی قەسابخانەیەکە بۆ خۆی و چەند خولەکێک ناخایەنێت مشک دەگۆڕێت بۆ گیانلەبەرێکی تەواو ئیفلیج بە هۆی پێوەدانی هەنگەکانەوە و دەمرێت.

بەڵام دیمەنە سەرنجڕاکێشەکە لەڕاستیدا دیمەنی دوو شاژن لە شاژنەکانی هەنگە کە زۆرانبازی دەکەن تا مەرگ و،تەواوی گەلی شانەکە لە ترس و سامدا بەدەوریانەوەن تەماشایان دەکەن و کەس خۆی تێ ناگەیەنێت، چوونکە شانە تەنها جێی یەک شاژنی تێدا دەبێتەوە و دەبێت یەکێک لە شاژنەکان یا بمرێت و یانیش بڕوات و شانەی خۆی دروست بکات.

هەروەها لەوە دەچێت هەنگ ئەندازیارێکی مەزنیش بێت. ئەو دیوارە جوانانە کە دابەش کراوە بۆ هەزاران ژووری شەشپاڵووی ناوازەی خودان ئەندازەی مەحکەم کە شاژن هێلکەکانی تیادا دادەنێت، هەر هێلکەیەک لە ژوورێکدا و لەشکری هەنگی کارگوزار چاودێری لەم هێلکەیە دەکەن تا هەڵدێت و دەبێتە کرمۆکە، ئینجا هەنگوینی دەرخوارد دەدەن تا دەگاتە قۆناغی نێوان کرمۆکەیی و مێرووی تەواو، پاشان بە حەریر دایدەپۆشن و ژووری بەسەردا دادەخەن تا قەدەکەی ڕاست دەبێتەوە و دەبێتە هەنگێکی پێگەیشتوو، ئەوسا دێتە دەرەوە تا بەشداریی چالاکییەکانی ناو شانەکە بکات.

ئینجا ژووری تایبەت بە هەڵگرتنی هەنگوین و شانەی هەنگوینیان هەیە و ژووری فراوانی تایبەت بە داڵدەدانی شازادەی کچانی شاژن بوونی هەیە.

پاشان لەشکرێک لە نێری بێکار کە هیچ فەرمانێکیان نییە کاتی پیتاندن نەبێت، کاتێک لە بەهاردا شاژن لە شانە دەچێتە دەرەوە و دەفڕێت، ئەو لەشکرە نێرە دوای دەکەون، شاژن بە یارمەتیی باڵە درێژە بەهێزەکانی هەر بەرز دەبێتەوە و نێرەکانیش بەدوایەوە پێشبڕکێ دەکەن و دانەبەدانەیان بەدوای یەکدا لەتاو ماندوویی ئەو بەدواداڕاکردنە ناگونجاوە بەهیلاک دەچن و دەکەونە خوارەوە تا یەک دانەیان لێ دەمێنێتەوە کە بەهێزترینیانە، ئەوسا شاژن بۆی دێتە خوارەوە و خۆی ڕادەستی دەکات تا بیپیتێنێت و پاشان نێرەکە دەمرێت، شاژن بەسکپڕی دەگەڕێتەوە تا هێلکەکەی دابنێت و چیرۆکەکە دووبارە دەست پێ دەکاتەوە. ڕێکخستنێکی ورد و دابەشکارییەکی توند لە ئەرک و فەرمانەکاندا و هاریکارییەک تا ئاستی قوربانی. بێگومان دەبێت ئەم هەنگانە لەنێو خۆیاندا بە زمانێک لێک بگەن و لەنێو ئەو زمانانەشدا دەکرێت سەما هەبێت. سەرت سووڕ دەمێنێت کە دەزانیت ئەو زمانە زمانی سەمایە. هەنگەکان بە ئاماژە و بە جووڵە و بە سەما قسە دەکەن. کاتێک هەنگێک لە کێڵگە دەگەڕێتەوە و گوڵی نزیک و پڕ لە شیلەی دۆزیوەتەوە، ئەو ئاماژەیەی ئەم پەیامەی پێ دەگەیەنێت ئەوەیە کە دەست بکات بە سەما و جووڵەیەکی بازنەیی دەکات و باڵەکانی دەدات بە یەکدا، پاشان دڵۆپێک لە شیلەکە لە بەردەمیاندا دادەنێت، هەنگە کارگوزارەکان بۆنی دەکەن و بۆنەکە بەباشی لەبەر دەکەن و دەر دەچن بەرەو گوڵەکان، جا ئەگەر ئەو گوڵە دۆزراوانە لە دووریی زیاتر لە سەد مەتر بن، ئەوسا دەبێت هەنگەکە بەدیاریکراوی ئاماژە بە شوێنیان بکات، هەر بۆیە سەماکەی لەسەر شێوەی بازنەیەک دەکات کە هێڵێک کردوویەتی بە دوو کەرتەوە و ئەم هێڵە ئاماژە بە ئاراستەی ئەو کێڵگەیە دەکات کە گوڵەکانی تێدایە، هەنگەکە لەسەر هێڵەکە دەڕوات و

ئەگەر هات و کێڵگەکە مامناوەند بوو لە ڕووی دوورییەوە، ئەوە سکی بە خێرایی دەلەرێنێتەوە و بەهێواشی دەیلەرێنێتەوە ئەگەر دوور بوو. چاوەکانیشی بەردەوام بەرەو ڕووی ئاڕاستەی کێڵگەکە دەبێت. ئیدی هەنگی کارگوزار لە ئاماژەکە تێدەگات و دەڕوات بەرەو ئاڕاستەی ئەو هێڵەی کە ئاماژەی بۆ دەکات، چ لە ڕاست یا چەپی خۆرەوە بێت و بە هەمان ئەو گۆشەیەی هەنگەکە بە سەماکردنەکەی کێشاویەتی بەم شێوەیە ڕێک دەگاتە شوێنەکە.

بێ شک هەنگی ئەندازیار کیمیاگەرێکی مەزنیشە، چوونکە توانیویەتی ژەهر و هەنگوین دروست بکات و شانە و شیلە ئامادە بکات. دوو دەستی هەیە بەڕاستی شایاتی ماچکردنن. ئای چ دوو دەستێکن. هەریەکێکیان کەوچک و فڵچە و گسک و دەستەسڕێکی چاکن بۆ پاککردنەوە و سڕینەوە، هەریەکێکیان هونەرێکیان لێ دەبارێ و لە یەک کاتدا دەیان فرمان بەئەنجام دەگەیەنن. باڵەکان ماسولکەگەلی نایابیان پێوەیە گرژ دەبن تا هەنگەکە لە چرکەیەکدا ٥٠٠ جار بکێشێ بە هەوادا، چەندە بوونەوەرێکی ناوازەیە! چ کۆمەڵگایەکە! چ ڕێکوپێکییەکە!

لە هەرتاکێکیان بەپێی تواناکەی وەردەگرن و بەپێی پێویستییەکەی پێی دەبەخشن، دەڵێیت ئێمە لە کۆمەڵگایەکی خەیاڵیداین لەو کۆمەڵگایانەی (ماوتسی تۆنگ) خەونی پێوە دەبینی، نەک شانەیەکی هەنگ.

ئیتر ئا ئەمەیە مێروو، هەمان ئەو مێرووەی بەگاڵتەپێکردنەوە ناوی دەهێنرێت، کێ کەمترینی ناو خەڵک بێت پێی دەڵێن تۆ مێرووی، بەڕاستی ئەمە گاڵتەپێکردنێکی نابەجێیە.

پێم وا بێت ئەو خانمانەی ئەمەیان خوێندەوە گەر ئەمشەو باوکی تووڕەیان پێی وتن ئێوە مێروون تووڕە نابن، چوونکە ئەوەتا مێرووی

هەنگ شاژن و ئیمپراتۆرێکی مەزنە هەمووان مل بۆ ئاماژەی کەچ دەکەن. خانمی هەموو نێرەکانە و بۆ خزمەتی خۆی کۆیان دەکاتەوە و بەهێزترینیان بۆ هاوسەرگیری هەڵدەبژێرێت و پاش پیتاندنیش دەمرێت، مێی جاڵجاڵۆکە لەمەش زیاتر دەکات، پاش پیتاندن خۆی نێرەکەی دەخوات.

بۆیە ئەوەی یەکێک مێروو بێت، ئەوەندەش خراپ نییە کە پێمان وایە بەڕاستی. ڕاستە کرمی لۆکە لۆکە دەخوات و دراوە بەنرخەکە دەخوات، بەڵام کرمی ئاوریشمی ئاوریشم دروست دەکات و پەپوولە گوڵ دەپیتێنێت و بەمە درەخت بەر دەگرێت و، هەنگیش هەنگوین دروست دەکات. لە کۆتاییشدا تاقە مێروویەک لە چەند ڕۆژێکی کەمدا ١٦ ملیۆن نەوە لە نێر و مێ دەخاتەوە، کە بەڕاستی گەلێکە بۆخۆی.

پێت وا نییە بیرۆکەیەکی خراپ بێت ژنێک تاقی بکاتەوە بچێتە سەر ئەم ڕەگەزە سەرسووڕهێنەرەی کە وشکانی و دەریا و هەواشیان گرتووەتەوە و لە هەموو ژینگەیەکدا ژیاون و بەرگەی هەورەبروسکە و گەرما و سەرما و بەستەڵەکیان گرتووە. ئەو ڕەگەزەی هەموو سیستەمە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان و هەموو شێوازە ڕەفتاری و ئەخلاقییەکانی لەخۆ گرتووە، ئەو ڕەگەزەی ئاقڵە بەبێ ئەقڵ و زانایە بەبێ زانست، بێ شک ئەزموونێکی پڕجۆشوخرۆش دەبێت.



## ئێمە و مەیموونەکان

ساڵی ١٩٢٥ و لە ناوچەی دایتۆن لە ئەمریکا، مامۆستایەکی زانستی زیندەوەرزانی وانەیەکی دەربارەی بیردۆزی داروین بە خوێندکارەکانی وتەوە کە چۆن مرۆڤ لە باوانی مەیموونەوە هاتووەتە خوارەوە. سەرەنجام کەنیسە هەستا و مامۆستای بە تۆمەتی بڵاوکردنەوەی بێباوەڕی دایە دادگا، پارێزەرێکی لێهاتووش بۆ بەرگریکردن لە تۆمەتبار هاتە پێشەوە بە ناوی ((کلانس دارۆ)) و داوای گفتوگۆی لە داواکاری گشتی کرد، کە ئەو کات سیاسەتمەداری ناودار ((ولیان برایان)) بوو. گفتوگۆکە گاڵتەجارییەک بوو بۆ خۆی، چوونکە برایان تەواو نەزانە بە پێشکەوتنە نوێیەکانی زانست و جگە لە ئایینەکەی خۆی هیچێک دەربارەی یەک ئایینی تر نازانێت و بیروبۆچوونەکانی هەر ئەوانەن کە یەکەم جار لە ژوورەکەی دایکیەوە وەری گرتوون. ئیدی لەوێدا پارێزەرەکە ئەو وتە ناودارەی وت کە لەو ڕۆژەوە بووە دەستوور: جەنگانی مرۆڤ بەتوندی و دڕندانە لەپێناو دیدگایەکدا کە هیچی لەبارەوە نازانێت، خودی خیانەتی هزرییە.

چەند ڕۆژێک پاش ئەو ڕووداوە برایان لە خەفەتدا دیقی کرد و مرد و بەیداخی بیردۆزی داروین بەرز کرایەوە تا ببێتە یەکێک لە بەڵگە نەویستراوترینەکانی زانستی زیندەوەرزانی.

داروین چی وتووە تا ئاوا هەموو زارەکان بێدەنگ بکات و هەموو ئەقڵەکان گوێقوڵاخ بکات. ئەمە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ ساڵی ١٨٣١ و (چارلز داروین)ی لاو بەسەر پشتی کەشتییەکەوە، کەشتیی (بیگڵ)، بە چواردەوری جیهاندا گەشت دەکات و تێبینی کۆ دەکاتەوە و تا ساڵی ١٨٥٩ لەسەر کۆکردنەوەی تێبینییەکانی بەردەوام دەبێت. لە گەشتەکەیدا شتگەلی زۆری بینی کە بانگیان دەکرد بۆ بیرکردنەوەی ورد و قووڵ. ئەوەی کە ژیان بەردەوام هەمەڕەنگی دەنوێنێت و خۆی دەگونجێنێت و پێکهاتەی خۆی دەگۆڕێت تا لەگەڵ ژینگەکەیدا بگونجێت. لە ناوچە بەستەڵەکییەکان مرۆڤ قەڵەوە و چەوریی زۆرە، ڕێک وەکوو ورچ و نەهەنگ، تا خۆی لە سەرما بپارێزێت، لە ناوچە کەمەرەییە گەرمەکانیش لاواز و کەمکێش و ڕەشە، هەر دەڵێیت چەترێکی بۆ پێستی دروست کردووە تا لە تیشکی خۆر بیپارێزێت، ئەو مارمێلکانەی لە تاریکایی ئەشکەوتەکاندا دەژین هیچ کاریان بە بینین و بە ڕەنگەکان نییە، هەر بۆیە دەبینیت کوێرن و ڕەنگیشیان نییە، لە کاتێکدا مارمێلکەی دەشتاییەکان چاوتیژن و ڕەنگاوڕەنگیشن.

ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم گیانلەبەرە جیاوازانە لە بنەڕەتدا یەک ڕەگەزن و وەچەکانیان جیاوازە، چوونکە لە ژینگەی جیاواز لە یەک گیرساونەتەوە، ئیدی هەریەکە لەگەڵ ژینگەی خۆیدا گونجاوە، بۆیە هەندێک گیانلەبەر کە دابەزیونەتە نێو ڕووبارەوە پێیەکانیان پەرەی سەندووە بۆ پەڕەکە و بوون بە ماسی، قۆڵی هەندێکی تر گۆڕان بۆ باڵ کاتێک هەوڵیان داوە بگەنە هەوا و ئاسمان و بوون بە

باڵندە، هەر وەک پێستی ڕووت لە ناوچە ساردەکان بەرگی فەرووی بە بەردا کراوە و پێستی باڵندەکانیش پەڕی سووک و تەنک تا وەکوو پەروانە بەکاریان بهێنن.

ئایا جیاوازیی دەمەکان لەنێوان دەمێکی خودان دانی خەنجەری تا ببڕێت و پارچەپارچە بکات وەکوو پڵنگ و،دەمێکی دەنووکدار شتی پێ هەڵبگریت وەکوو باڵندەکان و، دەمێکی قولاپدار کە لە شت گیر دەبێت وەکوو دەمی کرمی ئەنکلستۆما کە خۆی بە دیواری ڕیخۆڵەکانەوە دەگرێت، دەمێکی سۆندەدار بۆ مژین وەکوو مێش و دەمێکی دەرزیدار بۆ پێوەدان وەکوو مێشوولە و دەمی مشاردار و هاڕەڕ بۆ هاڕین وەکوو مێرووە قرتێنەرەکان. ئایا ئەم جیاوازییانە لە حەقیقەتیاندا پێش ئەوەی جیاوازیی جەوهەری بن لە پۆلی ئاژەڵیدا، جیاوازین لە فرماندا؟ ئایا ژیان لە بنەڕەتیدا خاوەنی یەک دایک و باوکە و هەموو جۆرەکان لەوانەوە شۆڕ بوونەتەوە و بە هۆکاری جیاوازی ژینگەکانیان جیاوازن؟

گەر بابەتەکە بەم جۆرە بێت، ئەوسا دەبێت توێکاریی لێکچوونێکی جەوهەری لەنێوان هەموو پۆلە جیاوازەکاندا بدۆزرێتەوە. هەر ئەمەش بوو ڕووی دا و بەڕاستی لێکچوونەکە سەرسووڕهێنەر بوو.

توێکاری دەریدەخات ئەو مارەی ئێستا بێ قاچوقوولە لە ڕاستیدا چوار قاچی باریکی شاراوەی لە پەیکەری ماسوولکەییدا هەیە، کە دەرخەری ئەوەن ئەم مارە لە وەچەی بوونەوەرێکەوە هاتووە کە لەسەر چوار قاچ ڕۆیشتووە. ئەو باڵندانەی وا دەر دەکەوێت خاوەنی یەک جووت لە پەلەکان بن، توێکاری دەری دەخات کە باڵەکانیان جووتی دووەمی پەلەکانیانە و ئاوا گۆڕاون بۆ باڵ تا لەگەڵ فرمانە نوێیەکەیاندا بگونجێن. ئەو ماسییانەی دێنە سەر ڕووی وشکانی و بە سییەکانیان

هەناسە دەدەن، توێکاری لە سییەکانیان دەکۆڵێتەوە تا ببینێت ئەمانە هەمان ئەو توورەکانەن کە ماسییە ئاساییەکان بۆ چوونەنێو قووڵایی دەریا بەکاریان هێناوە و پەرەیان سەندووە تا لەگەڵ فرمانی هەڵمژینی ئۆکسجیندا بگونجێن. چوار پەڕەکەی ماسی هەمان چوار قاچن و گۆڕان بۆ شتێک هاوشێوەی سەوڵ، ملی زەڕافە لەگەڵ درێژییەکاندا هەمان ژمارەی بڕبڕەی هەیە کە ئێمە هەمانە و ئەویش حەوت بڕبڕەیە، لەمەش زیاتر، ژیژک بەو ملە کورتەی خۆیەوە هەمان حەوت بڕبڕەی هەیە و بۆ نەهەنگیش بە هەمان شێوە. ژمارەی پەنجەکانی دەست و پێ لە ئێمەدا پێنجە و لە مەیموونەکاندا پێنجە و لە مشکدا هەر پێنجە و لە مارمێلکەشدا هەر پێنجە، تەنانەت شەمشەمەکوێرەکانیش توێکاری پێنج پەنجەی لاوازیان تیادا دەر دەخات.ئایا ئەم لێکچوونەنانە سەرسووڕهێنەر نین؟!

بەڵام ئەوەی شاردراوەتەوە گەورەترە، چوونکە دڵ و سووڕی خوێن لە نەهەنگ و مشک و مەیموون و مرۆڤ و شەمشەمەکوێرەدا بە هەمان پلان بەڕێوە دەچێت، هەمان خوێنبەر و خوێنهێنەر لە هەر جۆرێک لەو جۆرانەدا هاوشێوەیان هەیە و دڵیش هەمیشە لە هەموو شوێنێک هەر هەمان دڵە، بە چوار ژوورەکەی خۆیەوە. ئەو کۆئەندامی دەمارەی پێک دێت لە مێشک و دڕکەپەتک و دەمارەکانی هەست و جووڵە، هەمان کۆئەندامی دەمارە لە هەمووواندا. کۆئەندامی ماسوولکە بە ماسوولکەکانیەوە و ئێسکەپەیکەر بە ئێسکەکانیەوە، ئێسک بە ئێسک، هەموویان هاوشێوەیان لە جۆرەکاندا هەیە لەگەڵ جیاوازیگەلی بچووکدا لە شێوەیاندا تا بگونجێن لەگەڵ فرمانی هەر گیانلەبەرێکدا. کۆئەندامی زاوزێ، هەمان گون و هەمان هێلکەدان و هەمان کەناڵەکانی نێو گون و هێلکەدان و منداڵدانن لە هەموو گیانلەبەراندا، ئیدی هەرکەس بەنێو باخچەی ئاژەڵاندا بێت و بچێت، هەزار و یەک لێکچوون دەبینێت.

ئینجا ئایا ئەمە ڕێکەوتە کە ماوەی سکپڕی لای ئێمە نۆ مانگە و لای مەیموونە باڵاکانیش نۆ مانگە و لە نەهەنگەکانیشدا هەر نۆیە، تەنانەت ماوەی شیردانیش لە هەموو ئەوانەدا دوو ساڵە. هەروەها توێکاری دۆزیویەتەوە کە لە ئێسکەپەیکەری مرۆڤدا هەمان ئەو بڕبڕانە هەیە کە لە کلکی مەیمووندا هەیە و چوونەتە یەک و یەکیان گرتووە چوونکە فرمانێکیان نەبووە، لەمەش زیاتر ئەوەی کە هەمان ئەو بڕبڕەی کلکانە گۆڕاون بۆ بنکێکی پتەو بۆ حەوز لە مرۆڤدا.

پرسیارە ورووژێنەرەکەش ئەوەیە کە ئەم پەرەسەندن و گۆڕان و گونجانە لەنێوان ئەندامەکان و فرمانەکانیدا چۆن ڕووی دا؟چۆن کاتێک دابەزینە ناو ئاوەوە، قاچی گیانلەبەرەکان گۆڕا بۆ پەڕەکە؟! ئایا هێزێکی ڕێنوێنیکاری چاودێریکار هەبووە و ئەو شتانەی بەخشیوەتە گیانلەبەران کە پێویستییان پێی بووە و ڕێچکەکانی ژیانی بۆ ڕام کردوون؟

داروین دەڵێت کە هیچ هێزێکی ڕێنوێنیکار بوونی نەبووە و گیانلەبەران لە زۆرانبازییاندا لەبەرامبەر هێزی سروشتدا تەواو تەنها بوون و ئێمە تەنها بەشە پرشنگدارە جوان و بچووکەکەی چیرۆکەکەیان دەبینین و تەنها مشتێک لە خەرمانی ئەوانە دەبینین کە بەزیندوویی ماونەتەوە و ئەو ژمارە زۆرە نابینین کە بە دابەزینیان بۆ ناو ئاو لەناو چوون. چوونکە زۆرینەی ئەو گیانلەبەرانەی دابەزینە نێو ئاوەوە خنکان، بەڵام زۆربوون و وەچەخستنەوە ژمارەگەلی زۆری دەخستە نێو گۆڕەپانی جەنگەکەوە، بە جۆرێک قەرەبووی لەدەستدراوانی دەکردەوە و زیاتریش.

زۆربوون و وەچەخستنەوە لەوە زیاتریشی دەخستەوە، نەک تەنها ژمارە، بەڵکوو پۆلی جیاوازیشی پێشکەش دەکرد. لە ماوەی

پرۆسەی وەچەخستنەوەشدا بازدان لە بۆهێڵەکاندا ڕوو دەدات بە هۆی هەڵەگەلی بچووکەوە لە کرداری لەبەرگرتنەوە و گواستنەوەی سیفەتە بۆماوەییەکاندا، کە هەندێک جار ئەمە سەر دەکێشێت بۆ نەخۆشیی بۆماوەیی و شێوان و کۆرپەلەی شێواو. هەندێک جاریش نا، ئەم بازدانانە زیاتر بۆ ژینگە گونجاون، وەکوو ئەوەی کۆرپەلەیەک بە قاچی پانوپۆڕەوە گونجاوترە، (مانەوە بۆ گونجاوترینە) و وەچەکانیش دەژین، لەبەر ئەوەی ئەم قاچە پانوپۆڕانە لە قاچی ئاسایی چاکترن، بەمەش ئیدی زیاتر سیفەتی قاچی پان گەشە دەکات، چوونکە خودان قاچی ئاسایی لەناو دەچێت و دەخنکێت و تەنها قاچپانەکان دەمێننەوە.

ئەمە قسەی دارویِنە.

ئیدی بە پلەبەندی وردەوردە و بە ماوەی ملیۆنەها ساڵ، ئەم ئەندامە گۆڕاوە نوێیانە دێنە ناو بوونەوە کە ناویان پەڕەکەیە، بە هۆکارێکی سادە ئەویش ئەوەیە کە هەموو ئەو گیانلەبەرانەی بە قاچی ئاساییەوە لەدایک بوون بە خنکان لەناو چوون، لە کاتێکدا هەموو ئەوانەی بە قاچی وەکوو سەوڵەوە لەدایک بوون ژیان و زیادیان کرد.

ئەوەی دەگوزەرێت بژاردنێکی دڵڕەقانەیە بۆ گونجاوترین و چاکترین و لەناوچوون و مردنی ئەوانی ترە. ئەم بژارکردنە سەرەنجامی زۆرانبازییەکی خوێناوییە بۆ ژیان، نەک سەرەنجامی هێزگەلێکی ڕێنوێنیکار و کارڕێکخەر، دارویِن ئاوها دەڵێت. دارویِن بەم قسانەی و بە نکوڵیکردنی لە هەموو کارتێکەرەکان جگە لە کارتێکەری ماددی، کەنیسە و پیاوانی ئایینی لە خۆی هەڵساند و هەموو ناوەندەکانی تەنانەت ناوەندە زانستییەکانیشی تووڕە کرد.

جا دوای ئەوە چی ڕوویدا و ئەم چیرۆکە سەرنجڕاکێشە گەیشت بەکوێ؟



## کۆرپەلە چیرۆکەکە ئاشکرا دەکات

چاودێریکردنی کۆرپەلە لە پەرەسەندن و گۆڕانیدا لە ماوەی نۆ مانگی ناو سکی دایکیدا ئەو ئابڕووچوونە گەورەیە بوو کە بە قسەی داروین پەیوەندیی ئێمەی بە جیهانی گیانلەبەرانەوە و شوێنی دڵنیاکراوەمانی لە لووتکەی درەختی پەرەسەندندا ئاشکرا کرد، جا ئایا بەوردی چی لە منداڵداندا دەگوزەرێت؟

لە ڕاستیدا کۆرپەلە هەمان ئەو چیرۆکی پەرەسەندنە دووبارە دەکاتەوە کە سێ هەزار ملیۆن ساڵی خایاند و لە تاکە خانەیەکەوە دەستی پێ کرد تا شکسپیر، هەر ئەو چیرۆکەیە لە نۆ مانگدا بەپەستراوی دووبارەی دەکاتەوە. کۆرپەلە ژیانی بە تاکە خانەیەکی پیتێندراو دەست پێ دەکات (زایگۆت) کە وەکوو هەر میکرۆبێک دیواری منداڵدان دەخوات و لەناو پۆشیدا بۆشاییەکی گۆشتینی بۆ دروست دەبێت و پاشان دەست دەکات بە دابەشبوون بۆ دوو خانە و پاشان چوار و پاشان هەشت و هتد و هتد، پاشان یەک دەگرێت تا شانەیەک لە دوو چین پێک بهێنێت، چینی (ئیندۆدێرم) و (ئیکتۆدێرم)، هەر وەک زیندەوەرە سەرەتاییەکان، پاشان چینێکی ناوەندی بە ناوی (میزودێرم) دەر دەکەوێت، هاوشێوەی کرمەکان. لە چینی ئیندۆدێرمەوە هەناو و ڕژێنەکان و جگەر و پەنکریاس پێک دێت و لە ئیکتۆدێرمەوە پێست و

دەمارەکان و مێشک و چاو و گوێ و قژ و نینۆکەکان دروست دەبێت و لە میزۆدێرمیشەوە ماسولکەکان و دڵ و خوێنهێنەر و خوێنبەرەکان و ئێسکەکان دروست دەبن.

تەماشای لەوە سەیرتریش، کۆرپەلە لە یەکێک لە قۆناغەکانیدا لە ماسی دەچێت و لمۆزی هەیە، لە قۆناغێکی تردا کلکێکی بۆ پەیدا دەبێت و دواتر دەچێتەوە یەک و نامێنێت، لە قۆناغێکی تریشدا وەکوو مەیموون موو سەرتاپای جەستەی دادەپۆشێت، دواتر مووەکە لا دەچێت، تەنها ڕووبەرێکی دیاریکراو لە قژی سەر نەبێت دەمێنێتەوە.

بەم جۆرە کۆرپەلە ئەو بنەڕەت و ڕەچەڵەکەمان ئاشکرا دەکات کە لێوەی هاتووین، داروین وا دەڵێت. زانستی توێکارییش زیاتر لە جاران زۆربڵێیی دەکات و شت دەڵێت و فشە دەکات. چوونکە ئەوەتا دەڵێت ئەو پاشکۆیەی ڕیخۆڵەکوێرە کە لای ئێمە فرمانێکی نییە، لە کەروێشک و هاوشێوەکانیدا لە گیاخۆرەکان مێژوویەکی هەیە و لەواندا فرمانی زۆر گرنگی هەبووە، ئەویش هەرسکردنی سلیلۆزی ڕووەکی وێنجەیە و گۆڕینیەتی بۆ شەکر. ئیدی کاتێک ئێمە وازمان لە خواردنی گژوگیا هێناوە پێش هەزاران ساڵ، ئەو پاشکۆ زیادەیە چووەتەوە خۆی و بووەتە تەنها پاشماوەیەکی کۆنی لەناوچوو کە زیانی زۆرترە لە قازانج. هەروەها بێتەوە ئەم جار چەقۆی نەشتەرگەر کەوتە یاریکردن بە پشتەگوێی مرۆڤ تا کۆمەڵێک ماسولکەی ڕیشاڵی بدۆزێتەوە کە پاشماوەی ئەو ماسولکانە بوون کە وەختی خۆی گوێیەکانی باپیرانمان لە گوێدرێژان بۆ جووڵاندنیان بە هەرچوار لادا بەکاریان هێناوە، بەڵام کاتێک گوێیەکانی ئێمە لەو قۆچە سەرەتاییانەوە گۆڕا بۆ ئەم شێوە ئاڵۆزەی ئێستای، چیتر پێویستی بە جووڵە بە هەرچوار لادا نەما، چوونکە ئەم شێوە نوێیەی شەپۆلە دەنگییەکانی هەموو ئاڕاستەکان

زۆر لێهاتووانە و نایابانە وەر دەگرێت و پەرچ دەداتەوە، هەر بۆیە ماسولکە بنەڕەتییەکان چوونەوە یەک و نەمان و بوونە خانەی ڕیشاڵی. چیرۆکەکە شایەتی هەیە و ڕاستی بە زیاتر لە زوبانێکی ڕەوان خۆی ئاشکرا دەکات.

ئەوەندەی نەخایاند زانایانی شوێنەوارناسی و هەڵکۆڵەرانی چینەکانی زەوی لە هەموو لایەکەوە ئەو ڕاستییەیان هانی کە وەکوو بۆمب تەقییەوە.لەمیانەی هەڵکۆڵینەکاندا کۆمەڵێک ئێسکوپڕوسکی کەللەسەر کۆن دۆزرایەوە کە مێژووەکەی بۆ زیاتر لە ملیۆنێک ساڵ دەگەڕایەوە و ئێسکوپڕوسکەکانیش زۆر سەیر بوون و هیچ هاوشێوەیەکیان لەنێو ئەو گیانلەبەرانەدا نەبوو کە ئەو کات بوونیان هەبوو، ئێسکوپڕوسکی نێوەندی بوون، لەنێوان مرۆڤ و مەیمووندا. تایبەتمەندیی هەردوو ئادەمیزاد و مەیموونیشییان تێدا بوو.

جا ئاخۆ ئەم ئێسکوپڕوسکانە هیی کێن گەر هیی باووباپیرانی ڕاستەقینەی ئێمە نەبێت، ئەوانەی کە ڕەچەڵەکیان لقی شکستخواردووی دەستەوسانی وەکوو مەیموونی ئامۆزامان و ڕۆڵەی بلیمەتی وەکوو ئەو مرۆڤانە لێ کەوتەوە کە بەوپەڕی مەزنی و قەدرەوە نوێنەرایەتییان دەکەین. ئیدی هەر ئێسکوپڕوسکێک لەوانە بوونە ئاڵای جۆرێک لە جۆرەکانی مرۆڤە سەرەتاییەکان.مرۆڤی ترەنسفاڵ کە لە باکوری ئەفەریقا ئێسکوپڕوسکی دۆزرایەوە. مرۆڤی پەکین کە لە چین دۆزرایەوە و مرۆڤی چاوە لە چاوە و مرۆڤی نیاندەرتاڵیش کە لە ئەڵمانیا و ئیسپانیا ئێسکوپڕوسکی دۆزرایەوە.

هەندێک لەم کەللەسەرانە لە ئەشکەوتگەلێکدا دۆزرانەوە کە پاشماوەی داری بەخەڵووزکراوی لە شوێنی داگیرساندنی تایبەتدا

تێدا بووە، کە دەرخەری ئەوەن خاوەنی ئەم ئێسکوپروسکە ئاگریان دۆزیوەتەوە و بەکاریان هێناوە. لە هەندێک ئەشکەوتی تردا خەنجەر و چەقۆی بەردین دۆزراوەتەوە وەکوو ئاماژەیەک بۆ ئەو مێژووە دێرینەی کەرەستەکانی تێدا دۆزراوەتەوە. لە ئەشکەوتگەلی تریشدا لەسەر دیوارەکان وێنەی ڕاوکردن و نیشانشکێنی بینراون، وەکوو ئاماژەیەک بۆ شەیتانی هونەر کە لەو سەردەمە دێرینانەوە خەریکە یاریمان بەدەمەوە دەکات.

مێژووی ئێمە دە ملیۆن ساڵە دەستی پێ کردووە لە ترەنسفاڵەوە و ئەو کات تەنها برێک مەیموونی مرۆیی بووین پەرەیانسەند و کەرەستەکانیان پێش دەخست و باشتریان دەکردن تا نزیکەی ملیۆنێک ساڵ دەبێت کە سیفەتە مرۆییەکانی کامڵ بوون، لەو مێژووەوە هەر لەسەر پێشکەوتنی کۆڵنەدەر بووە تا بووەتە شکسپیر و موتەننەبی و ئەنیشتاین و ناپلیۆن.

بەڵام ئەگەر پەرەسەندن بەردەوامە، ئەوسا داهاتوو بەرەو کوێمان دەبات و ئایا وتەکەی داروین کۆتا وتەیە؟



## کەلێنێك لە بیردۆزەکەی داروینداا

ئەو هەڵلایەی داروین نایەوە کۆتایی هات و بیردۆزەکەی بوویە بەشێک لەو زانیارییە یەکەمییانەی خوێندکاران لە قوتابخانە ناوەندییەکان و زانکۆکاندا فێری دەبن و بووە بابەتێکی ئاشنا لە گۆڤارە هەفتانەییەکاندا و عورفێک لە عورفەکانی بیری هاوچەرخ. بەڵام زانایانی بایەلۆجی هاتن و داروین و بیردۆزەکەیان ئەمدیوودیو کرد و پرسییان: ئاخۆ هەر بەڕاستی ئەم پیاوە نهێنیی ژیانی بۆ ڕاڤە کردین؟ وەرن پێکەوە لەژێر ڕۆشنایی بیری نوێدا گفتوگۆی بکەین.

زۆر بەسانایی داروین دەڵێت کە بوونەوەرە زیندووەکان لە هەوڵدان بۆ گونجان لەگەڵ ژینگەدا؛ ئەندامەکانیان پەرە پێ داوە تا ڕووبەڕووی ئەو پێداویستییە هەمەجۆرانە ببنەوە کە ئەو ژینگەیە دەیخوازێت. ئەو گیانلەبەرانەی دابەزینە نێو ئاوەوە، پەڕەکە و کلک و ڕیشووەیان بۆ پەیدا بوو، ئەو گیانلەبەرانەی هەوایان گەمارۆدا، باڵ و پەڕ و جەستەی لاواز و کەم کێشیان بۆ دروست بوو، ئەو گیانلەبەرانەش کە زەوییان هەڵبژارد تا بەسەریدا بڕۆن، قاچوقول و قۆڵ و باڵ و نووکەپەنجەیان بۆ پەیدا بوو.

ئیدی بەم جۆرە جۆرەکان هەمەجۆرییان تێ کەوت و پۆلی جیاواز لە گیانلەبەران دروست بوو و هەریەکێکیشیان ئامادە کراوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ژینگەکەی. ئەو ژیانەی بە تاکە خانەیەک دەستی پێ کرد کە هەر خۆی بە هەموو فرمانەکان هەڵدەستا، پەرەی سەند بۆ گیانلەبەری فرەخانەی پێشکەوتووی تایبەتمەند و ئەو گیانلەبەرە پێک هات کە بتوانێت ڕووبەڕووی ژینگە ئاڵۆزە دژوارەکەی ببێتەوە و تیایدا بژی و زۆرانبازیی لەگەڵدا بکات. لەمیانەی ئەم زۆرانبازییە درێژخایەنەشدا ئیدی ئەو جۆرانەی توانای خۆگونجاندنیان دەسەلماند دەژیان، بەمەش خودی سروشت هەستا بە پرۆسەی هەڵبژاردنی باشترین و گونجاوترین و دوورخستنەوەی لاوازترین و ئەوانەیان کە کەمتر گونجاون، بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ شتێکی دی.

مرۆڤیش لە لووتکەی ئەم زنجیرە ئاژەڵییەدا پێگەیشت و بەسەر هەموویاندا سەر کەوت و بەهۆی توانای لەڕادەبەدەری بۆ خۆگونجاندن هەموو ئەوانیشی خستە ژێر دەستی خۆی، ئەویش ئەو توانایەیە کە دەزگا دەمارییە پێشکەوتووەکەی و ژیرییەکەی پێی بەخشیوە و ڕێگای داهێنانێکی نیشان دا بە هۆیەوە پێشی هەموو گیانلەبەرانی دیکەی دایەوە، ئەویش داهێنانی کەرەستەکان بوو. مرۆڤ تاکە گیانلەبەرە چاوەڕێ ناکات بازووی پەرە بسەنێت تا بگاتە هێزی شێر و زۆرانبازیی لەگەڵدا بکات، بەڵکوو خۆی خەنجەر و چەک دادەهێنێت و پەلاماری دەدات، بە هەمان شێوە چاوەڕێ ناکات باڵی لێ بڕوێت تا بفڕێت، بەڵکوو فڕۆکە دروست دەکات و کەشتی دروست دەکات و ژێردەریایی دروست دەکات.

ڕوونە کە سەرکەوتن و پێشکەوتن لە دیدگای داروینەوە یەک واتای هەیە، ئەویش پێگەیشتنی گونجاوترین جۆرەکانە لەچاو

کەمترگونجاوەکاندا، گەشەکردنی جۆرگەلی وا کە توانای کۆنترۆڵکردنی ژینگەکەیان هەبێت بەراورد بەو جۆرانەی کە بێدەسەڵاتترن. بابەتەکە بەسەر یەکدا بەرزبوونەوەیە لە توانا ماددییەکاندا نە کەمتر و نە زیاتر و جگە لەم تەنها پاڵنەرە سروشتییە، هیچ شتێکی دی کۆنترۆڵی ئاراستەی پەرەسەندن دەکات. ژیان ڕوو دەکاتە توانای زیاتر و لێهاتوویی زیاتر و دەستبەسەراگرتنی زیاتری ژینگە.

بەڵام ئایا ئەمە هەموو چیرۆکەکەیە؟

هەرگیز، ڕوویەکی تەواو پشتگوێخراو لەم سەربوردەیەدا هەیە، چوونکە ژیان ڕوو دەکاتە جوانترینیش و ئەم تێبینییە لە بیردۆزی داروینداا بوونی نییە و قسەکانی شتێکیان بۆ ڕاڤەی ئەم بابەتە تێدا نییە. بۆچی لە خێزانی گوێدرێژ شتێکی وەکوو ئەسپ دەردەچێت، یا لە پۆلی بەران شتێکی ناسکی وەکوو ئاسک. ئەسپ توانای بەرگەگرتنی لە گوێدرێژ زیاتر نییە، بگرە بە پێچەوانەوە، پێستی تەنکترە و کەمتر بەرگە دەگرێت، ئاسکیش بە هەمان شێوە لاوازتر و ناسکترە و پێستی کەمترە لە بەران. بە هەمان شێوە بۆ پەپوولەی ڕەنگینی ناسک، لاوازتر و ناسکتر و بێتواناترە لە زەردەواڵەی گیزەگیکەری زبر و تاڵ. کۆتر و پەڕەسێلکە و تاوس و چۆلەکە نەخشینەکان، هەموویان نەرمونیانترن لە هەڵۆ و بازەکان. ئیدی پێگەیشتن و بوونی ئەم جۆرانە ناتوانرێت بە یاسای مانەوە بۆ باشترینە ڕاڤە بکرێت، بەڵکوو بە یاسایەکی تر کە بریتییە لە مانەوە بۆ جوانترینە. جوانتر لە چاوی کێدا، خۆ ئەوان پێش مرۆڤ هەبوون!

جوانتر لە چاوی یەکدیدا؟ لەوانیشدا نێرەکان جوانترینی مێیەکان هەڵدەبژێرن، بەڵام بۆچی نێری گیانلەبەران مێیە جوانترینەکە هەڵدەبژێرێت؟ بۆ گیانلەبەریش تامی جوانی دەچێژێت و هەستی پێ دەکات؟

یاخود ئەوەتا ئەمە هەر ئاڕاستەیەکە ڕووەو جوانی، ڕووتێکردنێکە داماڵڕاو لە هەر ئامانجێک، جوانییەکی پەتی نە بە خاتری ئەوەی کەس بیبینێت و نە کەس چێژی لێ ببینێت، جوانی بە خاتری جوانی.

جوانی بەهایەکی پەرشکراوە بە هەموو بووندا، بەهایەکە بیردۆزێکی ماددی ناتوانێت ڕاڤەی بکات. بوونی مردوو جوانیی تێدایە و بوونی زیندووش هەر جوانیی تێدایە، گەردیلە تەلارسازی و ئەندازە و دابەشکردنێکی جوان و هاوسەنگیی ئەلکترۆن و پرۆتۆنەکانی تێدایە. ڕووەک هەمەجۆرییەکی بێشوماری دەوڵەمەند لە گوڵ و بۆنوبەرامە و ڕەنگ و شێوەی هۆشبەری درەختەکانی تێدایە. هەر توێژینەوەیەکی سەرپێیی گەڵای ڕووەکەکان دنیایەک پۆلی ناوازە و مۆدێلی بێشوماری جوانی و سەلیقەت پیشان دەدات، کە هەر دەڵێیت بە دەستی هونەرمەندێکی بلیمەت کێشراون. لە باڵندە و پەپوولە و لە جیهانی مێرووەکاندا و لە خشۆک و گیانلەبەرە ئاوی و وشکاوییەکاندا، ملیۆنەها شێوەی جوانی ناسکی وا بوونیان هەیە کە ناکرێت لەبەر لێهاتوویی یاخود بەرگەگرتن و یانیش مانەوەی باشترین دروست کرابن، بەڵکوو تەنها و تەنها لەبەر جوانی دروست کراون، چوونکە ناکرێت باڵی نەخشدار لە باڵی بێنەخش لێهاتووتر بێت بۆ فڕین.

کەواتە بابەتەکە جوانییە، شێکییە. لە سروشتدا هێزگەلێک هەن ئەوەندەی خەمی هێزی دروستکراوەکانیانە، ئەوەندەش خەمی جوانکردنی ئەم دروستکراوانەیانە، چین ئەم هاندەرانەی کار لە پەرەسەندن دەکەن و ئەم وێنە گەلێ جوانانە بەدی دەهێنن و پاڵنەرەکانی چین؟ داروین قسە ناکات و بیردۆزەکەش وەڵام ناداتەوە.

بەڵام لێرە و لەوێ کەسانێک بەرگری لە بیردۆزەکە دەکەن و دەڵێن، لە ڕاستیدا سەرگوزشتەی جوانی ئەوەیە کە مێ خۆی بۆ نێر

دەڕازێنێتەوە، ئەمە هەموو بابەتەکەیە و ئێمە لە بەردەم هاندەرگەلی سێکسیدا‌ین و هیچی تر. کە ئەمیش قسەیەکە وەڵام دراوەتەوە و ئەدرێتەوە بەسەر خۆیاندا، چوونکە ئەی بۆچی نێر مێیە جوانترەکە هەڵدەبژێرێت؟

کێشەکە هەر ماوە، ئێمە لە بەردەم هەڵبژاردن و پێباشتربوونێکین کە هیچ ڕاڤەیەکی ماددیی بۆ نییە، هیچ بەرژەوەندییەکی پەیوەست بە ژیان و مەرگەوە لەئارادا نییە، بەڵکوو لێرەدا بەهای باڵای جوانی خۆی بەسەر هەموو هاندەرەکاندا دەسەپێنێت. لێرەدا ئەوە ئەقڵی هونەرمەندی داهێنەرە دروستکراوەکانی دەڕازێنێتەوە، شوێندەستی لە گەڵای درەخت و ڕەنگی گوڵ و باڵەکانی پەپوولە و پەڕەکانی تاوسدا هەست پێ دەکەین.

لە بەردەم هەندێک درەختی بیاباندا واقمان وڕ دەمێنێت کە دەبینین سروشت تایبەتی کردووە بە تۆوی باڵدار تا بەو سارا و بیابانەدا بدات لە شەقەی باڵ و چەندین میل ببڕێت تا هەلە زۆر بچووکەکانی بۆ دەستخستنی ئاو بدۆزێتەوە. یاخود گەر لە هێلکەی مێش ڕابمێنین، بۆمان دەر دەکەوێت کیسەی هەوایی هەیە تا سەر ئاو بکەوێت، تا بچێتە ئاوەوە و نوقم نەبێت، هەموو ئەمانە هیچ شتێک ڕاڤەی ناکات ئەقڵێکی گشتی نەبێت کە بیر دەکاتەوە و ئەندازە بۆ دروستکراوەکانی دادەنێت، ئەگینا نە درەختی بیابان ئەقڵی بەوە دەشکێت باڵ بداتە تۆوەکانی و نە مێشیش یاساکانی ئەرخەمیدس بۆ سەرئاوکەوتن دەزانێت تا کەرەستەیەک بۆ مەلەکردن بە هێلکەکانی ببەخشێت، ئەمانە پرسگەلێکن بیردۆزی داروین بەتەواوی لە بەردەمیاندا دەستەوسانە و جگە لە ئەقڵێکی گشتگیر کە ئەندازەی بوون دادەنێت و دیزاین دەکات و داری دەخاتە سەر بەرد، هیچی دی ڕاڤەی ناکات.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم قسانەمان پێکەوە چیرۆکێکی خەیاڵیی گریمانەیی وێنا دەکەین، وا دادەنێین ئێمە کەموکورتییەکی دیاریکراومان لە هەستی بینیندا هەیە و ئەم کەموکورتییە وامان لێ دەکات ئامێرە جۆربەجۆرەکان ببینین بەبێ ئەوەی دروستکارەکەیان ببینین، بەم شێوەیە عارەبانەی دەست و ئۆتومبێل و شەمەندەفەر و دیزڵ و ئیدی هەر جۆرێکی دیی ئەم شتە لێخوڕدراوانە دەڵێیت دەیبینین بەبێ ئەوەی مرۆڤ ببینین. سەرەنجام دێین و دەڵێین کە ئەم شتانە بە زنجیرە قۆناغێک لە یەکترییەوە پەرەیان سەندووە و بەو لێکچوونەی لە پێکهاتەیاندا هەیە بەڵگە بۆ ئەم بۆچوونەمان دەهێنینەوە، چوونکە هەموو ئەم بوونەوەرانە لەوەدا لێکچوون کە لە ماددەی ئاسن و تەختە و پێستن و لە لاشە و لە تایە پێک دێن. لە ئۆتومبێل و شەمەندەفەر و دیزڵدا دەبینین بزوێنەرێک هەیە لە سلندەر و پستۆن پێک دێت و جارێک بە بەنزین کار دەکات و جارێک بە هەڵم و جارێکیش بە ڕۆنی دیزڵ. ئیدی لەبەر ئەوەی ئێمە ئەو دروستکارە نابینین کە هەموو ئەمانەی دروست کردووە، دێین و دەڵێین کە لە ئەنجامی زۆرانبازیدا لەگەڵ ژینگە و مانەوەی باشترین پاش جەنگە درێژخایەنەکانی مانەوە، ئەمانە بە پاڵنەری کارتێکەری ناوەکیی خۆیان پەرەیان سەندووە، لەبەر ئەوە بە چاوی سەر نایبینین، ئەو ژیرییە ڕەت دەکەینەوە کە دای هێناون و وایان دەبینین کە بە هۆکارێکی ناوەکیی خۆیان دەجووڵێن. هەر ئەم هەڵەیەش بوو داروین لە بیردۆزەکەیدا دەربارەی پێکهاتن و پەرەسەندن تێی کەوت، کاتێک وتی کارتێکەرەکانی پەرەسەندن کارتێکەری ناوەکین و ژیان بە هاندەرگەلی ناوەکی و دوور لە دەستێکی ڕێنوێنیکار پێش دەکەوێت، تەنها لەبەر ئەوەی دەستی ئەو دروستکارە نابینێت کە ئەندازەگیری دەکات و بەدیی دەهێنێت.

کەواتە ئێمە لە بەردەم بیردۆزێکداین کە پەیوەندیی خزمایەتیی نێوان خێزانی زیندەوەرەکانی لە ڕووەک و ئاژەڵ و مرۆڤ ئاشکرا کرد، بەڵام نەیتوانی بۆمانی ڕاڤە بکات کە چۆن ئەم پەرەسەندنە ڕووی دا.

ئێمە لە بەردەم بیردۆزێکداین ژیان وەکوو ماددە تێدەگات و پەرەسەندن بە پاڵنەرگەلی ماددی ڕاڤە دەکات. بەڵام لە هەموو حاڵەتەکاندا هەلومەرج شتێکی لەمە زیاتر دووپات دەکاتەوە، چوونکە ژیان تەنها ماددەیەکی پاڵنراو بۆ سەلماندنی خۆی و سەپاندنی قەڵەمڕەوی بەسەر ژینگەدا نییە، بەڵکوو ژیان کەسایەتی و جوانیی تێدایە. جوانییش بەهایە نەک بڕ، بڕێک بە چەند و کێش مەزەندە بکرێت. جوانی بەهایەکە پەیوەست بە خودەوە، بە ڕوحی درکپێکەرەوە و ناکرێت لە ژیان جودا بکرێتەوە، چوونکە بەهایەکی ڕەسەنی ژیانە. هەر بیردۆزێکیش ژیان وەکوو ماددە و دوور لە بەهاگەلی جوانی ڕاڤە بکات، بیردۆزێکی کورت و کوێرە. هەر وەک لەبەر ئەوەی بیردۆزی داروین بیردۆزێکی گشتگیری مەنهەجییە و پشت بە بونیادێکی لۆجیکیی ئەڵقەپتەو و پێکەوەبەستراو دەبەستێت، ڕووخانی یەک ئەڵقە لەو بونیادە سەر دەکێشێت بۆ ڕووخانی هەموو بونیادەکە، وەکوو بیردۆزەکەی نیوتن بۆ هێزی کێشکردن؛ کاتێک ئەنیشتاین یەک ئەڵقەی لێ کەواند هەر هەموو بیردۆزەکە داڕما.

وەکوو ئەندازەی ئیقلیدس کاتێک ڕیمان یەکێک لە کەلێنە بیرکارییەکانی تێدا ئاشکرا کرد، هەمووی بە جارێ هاتە خوارەوە و هیچێکی لێ نەمایەوە خەیاڵی منداڵێک نەبێت کە ویستی وێنای گەردوون بکات، ئیدی وای وێنا کرد لەسەر شێوەی دیزاینێکی ئاڵۆز لە هێڵی ڕاستەوڕاست بونیاد نرابێت، تا دواتر ڕوون بوویەوە کە گەردوون تاقە یەک هێڵی ڕاستیش لەخۆ ناگرێت و هەموو هێڵەکانی گەردوون هێڵی چەماوەن، تەنانەت خودی بۆشاییش، بەم جۆرە ئەو ئەندازەیەی ئیقلیدس کە لە

کتێبەکانی قوتابخانەدا خوێندمان گوایە ئەو ئەندازە نەمرەیە کە نە لەپێش و نە لەپاش، باتڵ و ناتەواوی ڕووی تێ ناکات، داڕووخا.

بۆ بیردۆزی داروینیش بە هەمان شێوە، هەموو ئەو دیاردانەی ژیانمان بۆ ڕاڤە ناکات کە دەیانبینین. هەر وەک خودی بیردۆزەکە دڵنیاییەکی زانستیی نییە، بەڵکوو لانی زۆر تەنها وادانانێکە و تا ئێستا لە هەموو ئەگەرەکان و هەموو گریمانەکان دەربارەی بەدواییەکداهاتنی ژیان و پەرەسەندنی، بەهێزترە، بەڵام بەکارخستنی بیروهۆش کەلێنێکی مەترسیدارمان لەو بیردۆزەدا بۆ ئاشکرا دەکات، ئەویش ئەوەیە سەرەڕای ئەوەی داروین بە پێشەکیگەلێکی زانستیی ڕاست و دروست دەست پێ دەکات، کە ئەویش لێکچوونی توێکاریی نێوان دروستکراوەکانە، بە جۆرێک بەرەو ئەوە دەچن لە یەک خێزان بن، بەڵام لەم پێشەکییانەوە پەل دەهاوێژێت بۆ هەڵێنجاندنی ئەنجامگەلی لادەر لە سروشتی ئەو پاڵنەر و هاندەرانەی ئەم پەرەسەندنەیان بەڕێوە بردووە، دەڵێت گوایە هەمان هاندەری مانەوەیە لە هەموو گیانلەبەراندا و گوایە بەرژەوەندییە ژیانییە ماددییە پەتییەکان، ئەم هەمەجۆری و جیاوازی و شێوەوەرگرتنانەیان، لە کۆی درەختی گیانەوەراندا کۆنترۆڵ کردووە، کە ئەمەش هەڵێنجاندنێکی پانوپۆڕی گەورەیە بە بەری ڕاستیدا و نازانستییانەیە، چوونکە بینییان کە بەها ڕوون و ئاشکراکانی جوانی لە پێکهاتەی زیندوودا، هیچ پێویستییەکی ژیانی داخوازی نییە و یەکێکیش نییە لە پێداویستییەکانی مانەوە، ئەوەتا گوێدرێژ هەمان دەسەڵاتەکانی مانەوەی هەیە کە لای ئەسپ هەیە و بە هەمان شێوەش بۆ ئێستر و گا و بەراز.

کەواتە بۆچی فڵچەی ژیان ئەم وێنە ناوازەیەی لە جوانیی گەڵای درەختەکان و باڵی پەپوولەکان و پەڕەی گوڵان و پەڕی تاوسەکان

و لاشەی ئاسکەکاندا نەخشاندووە؟ ئێمە لێرەدا لە بەردەم دەستی ئەندازیارێکی داهێنەری هونەرمەندی بەدیهێنەردایین کە بە شاراوەیی کار دەکات و شوێنەواری لە هەموو خانەیەک و هەموو پەڕێک و هەموو تاڵەموویەکدا دەر دەکەوێت.

بیردۆزی داروینی ماددییش هەرجۆرە دەستتێوەردانێکی دەرەکی و هەموو دەستێکی ڕێنوێنیکاری ڕەت کردووەتەوە کە ژیان بەڕێوە ببات و لە گەشتی ملیۆن ساڵەیدا ڕێگای نیشان بدات. هەر وەک پێی وایە کە جگە لە بەرژەوەندیی مانەوە هیچ شتێکی دی ژیانی کوێر ناباتە ڕێوە و هەڵنانێت. بەڵام ئەوەتا ئێمە دەبینین کە ئەمە ڕاست نییە و شانەی زیندوو لە هەموو وردەکارییەکانیدا ئەو دەستە ڕێنوێنیکارە هونەرمەند و داهێنەرە وێنەکێشە تەوانایە بەسەر هەموو شتێکدا دەر دەخات، ئەو دروستکارە ئەزەلییەی بۆ بەدیهاتن بەدیی دەهێنێت و بۆ جوانی دەڕازێنێتەوە، هەریەک بۆ مەبەستی خۆی.

ئەمە کەلێنێکی گەورە و فراوانە کە ئایین لێیەوە دەچێتە ژوورەوە و لەوێوە سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە.

هەر وەک ئەمە تاکە کەلێن نییە، چوونکە ئەڵقەیەکی ونبووش لەنێوان مەیموونە باڵاکان و لەنێوان مرۆڤدا هەیە لە سەربوردەی بە ناو پەرەسەندندا، ئێسکی مرۆڤی چاوە و مرۆڤی نیاندەرتاڵ و مرۆڤی پەکین و مرۆڤی ترەنسفاڵیش ئەم کەلێنە پڕ ناکەنەوە، چوونکە زیاتر لە ئێسکی مرۆڤ دەچن وەک لە ئێسکی مەیموون و باپیرە مەیموون هێشتا بێسەروشوێنە و بە دەیان ئەڵقەی ونبوو لەنێوان هەموو ئاستێکی گیانلەبەراندا بوونی هەیە.

بیردۆزی داروین بەرگێکی تیۆریی جوانە و گومانی تێدا نییە، بەڵام پڕە لە پێشێلکاری و هەڵەیەکی زانستییە ئەگەر وەکوو بابەتێکی دڵنیاکراو وەری بگرین، ئەرکە وەکوو بیردۆزێک یا ئەگەرێک یا گریمانەیەک کە لە هەموو گریمانەکانی تر ئەگەری زیاترە دای بنێین.

من سەرم ناسوورمێ گەر سبەینێ زانایەکی نوێی بایەلۆجی لێمان پەیدا بوو هەرچیی بیرۆکەمان هەیە دەربارەی ژیان سەراوژێر بکات، هەر وەک ئەنیشتاین لە سروشتدا و ڕیمان لە ئەندازیاریدا و گالیلۆ لە فەلەکدا و پاستیر لە پزیشکیدا ئەنجامیاندا و، سەرەنجامێکی جێی واقوڕمان نابێت گەر داروینیش بە دەردی نیوتن و ئیقلیدس بچێت و بچێتە دەروازەی فراوانیی لەبیرکردنەوە.



## ئەی پاش پەرەسەندن چی؟

مێژوو وانەیەکی گەورەی خاکی بوونمان فێر دەکات، چوونکە ڕێی تێ دەچێت ئێمە بەتەواوی لەناو بچین و تەنانەت شوێنەواری ڕەگەزەکەشمان نەمێنێت و لەبەرامبەردا ڕەگەزی دیکە پەرە بسەنێت و ژیان بگرێتە دەست و نەوەی شوێنگرەوەی ژێریان لێ دەر بچێت، ئیدی ڕەنگە ئەو سەرگەورە نوێیانەی ژیان لە ڕەچەڵەکی مێرووله یا هەنگ یا سیسرک بن، کێ دەزانێت.

ژیان سەربوردەی وەچەیەکی مەزنی قەبارە زۆر گەورە و زۆر بەهێزمان بۆ دەگێڕێتەوە بە ناوی دەیناسۆڕەکان، کە هەریەکێکیان ڕۆیشتووە بەڕێدا وەکوو چیایەکی جووڵاو وابووە، لەبریی ساڵێک سەد ملیۆن ساڵ ژیاوە و چێژی لەم سەرگەورەییەی ژیان وەر گرتووە، پاشان چاخی بەستەڵەک هاتووە و تەفروتونای کردووە، چوونکە نەیتوانی خۆی بگونجێنێت، هیچ ڕێگایەک بۆ بەرزکردنەوەی پلەی گەرمیی لەشی نەبوو، ئەوە نەبێت کە لەژێر تیشکی خۆردا دابنیشێت. ئیدی کاتێک بەستەڵەک زەویی شاردەوە، ئەم ڕەچەڵەکە دۆزەخییەی وەکوو سەگەکانی خەرج کرد و شوێنەوارێکی بۆ نەهێشتن، چوونکە ئەو خۆرەی خۆیان دەدایە بەری، چیدی پەیدا نەدەبوو.سەبارەت بە خۆشمان، تا ئێستا تەمەنمان لەسەر زەوی نەگەیشتووەتە سەد ملیۆن

ساڵ وەکوو دەیناسۆرەکان، بگرە تەمەنمان بە تۆزێ چاوپۆشیشەوە و بە کۆکردنەوەی لەگەڵ دێرینیی بە ناو مەیموونیشمانەوە تەنها دە ملیۆن ساڵە.

ئێمەی مرۆڤ ژیری و زیرەکیمان گەورە بوو، کەرەستەکانمان پەرەی سەند و گەشتنە فڕۆکە و بۆمبی ئەتۆمی، جا ئەگەر بێت و بە ئەندازەی ئەم پێشکەوتنە ئەقڵییەمان لە ڕووی سۆز و مرۆڤایەتییشەوە پێش نەکەوین، ئەگەر نەتوانین بەو ئەندازەیەی بەهێزین خۆشەویستی ببەخشین و بەبەزەیی و بەڕەحم بین، ئەوا گومانی تێدا نییە خۆمان دەفەوتێنین، هەمان ئەو هێزەمان لە جەنگێکی ئەتۆمی بێبەزەییدا لەناومان دەبات. ئەوسا ژیانیش خەفەتمان بۆ ناخوات و هەر بە بای خەیاڵیشیدا نایەت، چوونکە فێری کردووین کە ئەو نە خەم پێدەزانێت و نە پەشیمانی و ئەوەی دەمرێت و لەناو دەچێت لە نەوەکانی، ملیۆن ملیۆنی تر هەیە جێگەیان بگرێتەوە و فێڵی وەهای هەیە لە ئەفسانەکانیشدا بوونیان نییە و، کاتێک دەکەوینە ژێر کەلاوەی وێرانەی ئەتۆمییەوە و لەناو دەچین، ژیان خۆڵ دەکات بەسەرماندا و دەڕوات بە ڕێی خۆیدا و ڕێڕەوی مەزنی ڕوو دەکاتە ئاراستەیەکی تر و پەرە دەسەنێت تا بەدەستهاتوویەکی نوێ لە بوونەوەر بخاتە ئەبەدیەتەوە و زمانی حاڵیشی دەڵێت:

با جارێکی تر تاقیی بکەینەوە، خۆ ئێمە پەلەمان نییە، زەمانێکی دوورودرێژ و بێکۆتامان لەپێشە، هەموو ئەبەد تاقی دەکەینەوە.

لە ڕووی زانستییەوە بە ئەندازەیەک پێش کەوتین، کە پڕی کردین لە خۆبەزلزانی و لەخۆگۆڕان، ئەوەتا گەشت دەکەین بۆ سەر مانگ و کەشتیی ئاسمانی دەنێرینە مەریخ و کەشوهەوای زوهرە تۆمار

دەکەین. بەڵام لە ڕاستیدا گەر لەم پێشکەوتنە ڕابمێنین، دەبینین زیاتر جێی داخ و خەفەتە وەک لە دڵخۆشی، چوونکە ئەو مرۆڤەی چارەکەملیۆنێک میل هەنگاوی بەرەو مانگ ناوە، نەیتوانیوە هەنگاوێکی چەند مەتری بۆ هاوکاریی ئەو برایانەی بنێت کە لە هیندستان لە برسا دەمرن و لە قودس و ڤێتنام ستەم هەلاهەلایان دەکات، ئەمریکا لەسەر ڕووی مانگ دەگات بە ڕوسیا، کەچی ناتوانێت لە ئەنجومەنی ئاساییش دەستی پێی بگات، مەودای نێوان هەسارە و ئەستێرەکان لێک نزیک بووەتەوە و دووری و مەودای نێوان مرۆڤەکان لەسەر زەوی دوورتر کەوتووەتەوە. ئەوەتا ئێمە ڕۆژبەڕۆژ لە یەکدی دوور دەکەوینەوە، هەر دەڵێی پریشکین و بە بۆشاییدا پەرش دەبینەوە و کەس گوێی لە کەس نییە و بەزەحمەت بۆچوونێک دەگۆڕینەوە یا گوێ بۆ یەک دەگرین یاخود دڵمان بۆ یەک دەکەینەوە، مرۆڤ وا دەست دەگرێت بەسەر گەردووندا، بەڵام هێشتاش لەبەرامبەر کۆنترۆڵکردنی خۆیدا دەستەوسانە، تا هێزی بازووش زیاد بکات، دڵی لە سۆز و میهرەبانی خاڵی دەبێتەوە.

مرۆڤی سەدەی بیستەم بە جەستە زەبەلاحە، پێیەکی لەسەر زەوییە و پێیەکیشی لەسەر مانگ، بەڵام ڕوحی قەزەمە، ئەقڵی هەرزەکارە و دەشێت بێ ئەوەی پێبزانێت خۆی لە خۆبەزلزانی و گەمژەییدا لەناو ببات.

دەرچوون بەرەو بۆشایی ئاسمان کە لە ڕووکەشدا پەڕجوویەکی زانستییە، لە ڕاستیدا هەڵهاتنێکی دەروونییە لە بێتوانایی ڕوحیی مرۆڤ و لە کێشە گەورەکانی لەسەر زەوی، کردارێکی هەڵهاتنی شیکە، گومانی تێدا نییە و دەیسەلمێنێت کە مرۆڤ فێڵبازێکی بلیمەتە و دەزانێت چۆن بێدەسەلاتییەکەی بە بەرگەلی ماددیی بریقوباق داپۆشێت.

ئەوەشی ئەمڕۆ لە دەوروبەرمان دەیبینین، دەرخەری ئەوەیە کە گەشەسەندنی هێزە ماددییەکان زۆر لە گەشەسەندنی خۆشەویستیی نێو دڵان ئاسانترە و بەرزبوونەوە بەرەو مانگ زۆر لە بەرزکردنەوەی ڕەوشتی مرۆڤ ئاسانترە، ئەگەرچی یەک پلەش بێت. ئێمە هێزی مادده و دەستەوسانییەکەشی دەبینین. هەرچی هێزە ئابوورییی هەیە بەیەکەوە هەرچەندە دۆلارەکانیشییان هاوپەیمانی ببەستن، ناتوانن مرۆڤێکی جوامێر و بەئەمەکمان بۆ دروست بکەن. بەڵکوو ڕەوشت بە کۆششی ماندووکەری نێوان هێزە ڕووحییە قووڵەکانی ناو ناخی مرۆڤ و ململانێی خوێناوییان لەگەڵ هێزە ئاژەڵییەکان و هاتوهاواری گەدە و وەڕینی سێکس و فریودەریی هێزوبازوودا گەشە دەکات، کە ئەمانە کارگەلی زۆر دژوارن، پێویستیان بە پلەی باڵای دڵسۆزی و ڕاستگۆیی لەگەڵ خوددا و ڕووبەڕووبوونەوەی ڕۆژانە لەگەڵ هۆکارەکانی لاوازی و پێداگریی چێژەکان و دەستکەوتە ئاسانەکاندا لە هەرساتێکدا هەیە، کە ئەمیش جەنگێکی فرە دژوارە و سەرکەوتنە سەر مانگ لەپاڵیدا کارێکی هەر زۆر ئاسانە، چوونکە پرۆسەی چوونەسەرمانگ پشت بە سوننەتە سروشتییەکان دەبەستێت، وەکوو یاسای کێشکردن و هێزی پاڵنانی موشەکی و توانای سووتانی گازەکان، کە هەموویان سوننەت و یاساگەلی سروشتین، خودای گەورە بەڕێکوپێکی دایناون و هەڵە قبوڵ ناکەن، بەڵام پەیوەندییەکانی خەڵکی و سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان پشت بە بەرژەوەندی و حەز و تەماح دەبەستێت و دروستکراوێکی لەناوچووی مرۆڤە و بەرهەمی نەفسە خەوشدارەکەیەتی، بۆیە هەڵهاتن لەو دەروون و نەفسانە و لە کەموکووڕییەکانیان بەرەو بۆشایی گەردوون، بەرەو ئەو شوێنەی پشت بە یاسا وردەکانی خودا دەبەستێت، کارە ئاسان و پارێزراوەکەیە

و هەزاران جار لەوە ئاسانترە مرۆڤ خەڵوەت لەگەڵ دەروونیدا بکات تا چاکی بکات و ڕاستی بکاتەوە، کە ئەمە لە هەمان کاتدا هەڵهاتنە لە پەیامی یەکەمی مرۆڤ لەسەر ڕووی زەوی، چوونکە یەکەم ئەرکی مرۆڤ لەسەر ئەم زەوییە ناسینی خۆی و ڕاستکردنەوەیەتی.

بە فیکر و ئایین و زانست پێکەوە مرۆڤ خۆی دروست دەکات، بەڵام بە زانستی ماددی بەتەنها و بەبێ باوەڕ و دوور لە ڕەوشت، تەنها زۆردارێک و دێوێکی زەبەلاحی شێواو دروست دەکات، کە لەنێوان هەسارەکاندا دێت و دەچێت و چەکی مەترسیداری قێزەون بۆ کوشتنی بەکۆمەڵ دروست دەکات، هەمووان و پاشان خۆشی پێ ماڵوێران دەکات و بە خۆشی نازانێت.

مەدەنیەتی سەدەی بیستەم ئەم ڕێگا ئاسانەی بۆ پێشکەوتن هەڵبژارد، ڕێگای ئەتۆم و وزە و کارەبا و ئاسن و پۆڵا و دینامیت و ئەوانی تری بە بیانووی ئەوەی غەیب و نادیارن فەرامۆش کرد، لەگەڵ ئەوەدا کە زانستی ماددی خودی خۆی نوقمە لە پەنهانیدا، کارەبا چییە؟ ئەلکترۆن چییە؟ وزە چییە؟ هەموویان پەنهانن، کارەبا بەکار دەهێنین و نازانین چییە، ئامێرە ئەلکترۆنییەکان دروست دەکەین و نازانین ئەلکترۆن خۆی چییە، تەوژمی بێوایەر دەکەینە هەواوە و نازانین تەوژمی بێوایەر چییە و شێوەی چۆنە، زانستی ماددیی چییەتی هیچ شتێک نازانێت، تەنها پەیوەندییەکانیان و بڕ و یاساکانیان دەزانێت، بەڵام نەزانە بە چییەتیی خودی شتەکان. سەرگوزشتەی پەنهانی بیانوویەکی درۆینە و ئامادەیە، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە مرۆڤ ڕێگە ئاسانەکەی هەڵبژاردووە کە پێویستی بە ڕووبەڕووبوونەوەی خود و تێکەڵبوون لەگەڵیدا، لە جەنگێکی مەزنی دژواردا بە ئامانجی گێڕانەوەی ڕەوشتەکانی نییە. ئەوەی پێ باشتر بووە خۆی فڕێ بداتە

ژینگەیەکیماددییەوە و هەوڵی گۆڕینی بدات، لەبریی ئەوەی لە خاڵی بنەڕەتەوە دەست پێ بکات و دڵنیایی دەداتە خۆی کە ئەگەر ژینگەی چواردەوری گۆڕا، ئەوسا ئەویش خۆی دەگۆڕێت و ئۆتۆماتیکی لەخۆیەوە ئەمیش بەرز دەبێتەوە.

ئەمە تاقیکارییەکی گەورەیە و مێژوو لە داهاتوودا وەڵامی دەداتەوە و بە درۆی دەخاتەوە. بگرە لەوە دەچێت دەستیشی پێ کردبێت، چوونکە ئەوەتا دەبینین لە ڕووە ماددییەکەوە هەموو ئاسۆکانی داهاتوو پەمەیی و پرشنگدارن، ئەوەتا مرۆڤ گەیشتە سەر مانگ، بەڵام لە ڕووە مرۆییەکەوە ئاسۆکانی داهاتوو تاریکن و بە مەترسی و دڕکوداڵ دەورە دراون. ڕۆژی زانست دەستی پێ کردووە و دەترسم بڵێم کە شەوی مرۆڤایەتیٚ و ژانی سەخت و تۆقینەری دەستی پێ کردووە. سەرەنجامان پەیوەستە بە شتێکەوە بە ناوی ئەقڵ، ئەقڵی خۆمان، بەوەوە کە ئاماژەی بۆ دەکات و ئەوەی ئەنجامی دەدات تا لەگەڵ ئەو هێزە نوێیەدا بگونجێت کە خۆمان خستووەتە ناوی. تا بشزانین ئەو دەزووانەی مەینەتی کە خەریکین دەیچنین دەگات بە چی و سەرەنجامی چی دەبێت، پێویستە زیاتر لەسەر ئەو مەتەڵە بزانین کە ناوی (ئەقڵە).



## سەنتەرێکی مەزن بە ناوی مێشك

یەکێک لە زانیارییە جێگیرەکانی توێکاری ئەوەیە کە مێشکی ئێمە لە دە ملیۆن ساڵی ڕابردوودا و لە سەردەمی بە ناو باپیرەی یەکەممانەوە (مەیموونی مرۆیی)، کە لە ترەنسفال ژیاوە، لە کێش و قەبارەدا دوو هێند بووە. ئەنجامی ئەم گەورەبوونەی مێشکیش ئەوە بوو کە کەللەسەریش لەگەڵیدا گەورە بوو، ئەمەش لەسەر حیسابی دەموچاو کە هەرچەندە مێشک بەرەو لای کشاوە، ئەم لە قەبارەی بچووک بووەتەوە تا ئەوەی کە جێگەیەک بۆ کاکیلەکانی ژێری نەمایەوە (چوونکە مێشک جێگەکەی گرتوون)، ئیتر بۆیە هەندێ جار دانی ژێری نەدەڕوا، یاخود بەسەختی دەڕوا. لەگەڵ بەکارهێنانی ئێمەشدا بۆ چەتاڵ و چەقۆ و کوڵاندنی خواردن و ڕووکردنە ئەو خواردنانەی جوینیان ناوێت، لە داهاتوودا ددانەکانمان لەناو دەچن و کلۆر دەبن، بە هۆی کەم بەکارهێنانیانەوە، لە ٣٢ ددانەوە دادەبەزن بۆ ٢٨ ددان، زانایان وامان پێ دەڵێن ئەگەر بێت و ڕێگایەک بۆ دەستپێوەبوون و بەکارخستنیان نەدۆزینەوە.

پرسیارە جێی سەرنجەکەش ئەوەیە کە بۆچی قەبارەی مێشک زیادی کردووە؟ بۆ ئەوەی وەڵامەکەش دەست بخەین، پێویستە سەرەتا بپرسین مێشک چییە؟

مێشک سەنتەرێکی مەزنە و زیاتر لە چواردە هەزار ملیۆن هێڵی دەماریی تێدایە کە لە شوێنە جیاوازەکانی جەستەوە بۆی هاتوون. دەماریَ چاو بەتەنها یەک ملیۆن هێڵی دەماریی هەیە کە لە چاوەوە بۆی هاتووە و ئیتر دەمارەکانی تریش لەسەر ئەم بپێوە.هەموو ئەم هێڵانە لە مێشکدا بەیەک دەگەن و مێشک هەڵدەستێت بە شیکردنەوەی پەیامەکانیان و وەڵامدانەوەیان بە وەڵام و کرداری یەکسەری. جگە لەم هێڵانە، هەزاران ملیۆن هێڵی دی دەبینین کە ڕۆڵی پێکەوەبەستنی سەنتەرە جیاوازەکانی نێو خودی مێشک دەبینن، چوونکە مێشک خۆی کارێکی تری هەیە کە بیرکردنەوەیە، هەر وەک وەڵامدانەوەی هەموو ئەو پۆلانەی ئاگادارکەرەوەکە پێی دەگات.

هەستە گرنگەکانیش لە مێشکدا سەنتەری دیاریکراویان هەیە و لقی بچووکتری تایبەتتریشیان لێ دەبێتەوە. سەنتەری بینین دەکەوێتە پشتەوەی مێشک و سەنتەرەکانی دەستلێدان و بیستن دەکەونە ئەملاولاوە و سەنتەرەکانی جووڵە لە ناوەڕاستدان و سەنتەرەکانی هاوسەنگی لە بەشی بچووکی تایبەتدان لە خوارەوەی مێشک کە ناوی (مێشکۆڵە)یە و سەنتەرەکانی هەناسەدان و سووڕی خوێن لە سەرەوەی دڕکەپەتکدان لەو شوێنەدا کە دەگات بە مێشک، سەبارەت بە بیرکردنەوە و خەیاڵ و وێناکردن و یادەوەری و درککردن بە داهاتوو و هەستکردن بە قەوارە و ڕامان و ورە و پلاندان، ئەوا بەشێکی گەورەی تایبەتیان لە (پشت نێوچەوان)ەوە هەیە و لە گیانلەبەرانی دیکەدا هاوشێوەیان نییە.

ئیدی بەم چەشنە هەر چالاکییەک سەنتەری تایبەتی خۆی هەیە، تەنانەت هەست و سۆز و ئارەزوو و سێکس و ئازار و چێژ و خەویش سەنتەریان هەیە، لە هەر سەنتەرێکیشدا ملیۆنان خانەی ئیشکگر هەن

کە وەکوو فەرمانبەری بەنۆرە لە حاڵەتێکی هەمیشەئاگاداردا کاردەکەن دەکەن و وەڵامی وردترین چرپە دەمارییەکانیش دەدەنەوە.

لە هەرساتێکی ئێستاشدا ملیۆنەها پەیام و ئاماژەی دەماری لە پێست و چاو و گوێ و لووت و لە هەناو و لە دڵ و لە موولوولەکانی خوێن و جگەر و سییەکانەوە و لە هەموو شوێنێکی لەشەوە ورووژم دەکەن و لەگەڵ خۆیاندا زانیاری و ئاگادارکردنەوەیان بۆ مێشک هەڵگرتووە، ئەمە جگە لە هێڵە بەستەرەکانی ناو مێشک خۆی لەنێوان سەنتەرە جیاوازەکاندا. لە هەمان کاتدا ملیۆنان هێڵی دەماریی دەرچوو لە مێشکەوە هەن کە پەرچەکرداری ئەو ئاگادارکەرەوانە لەخۆ دەگرن، ئەویش لەسەر شێوەی فرمانی جووڵە بۆ ماسوولکەکان و ڕێنمایی دەردان بۆ ڕژێنە جیاوازەکان و ئاماژەی وەرگرتنی ڕێکاری ڕەفتاریی تایبەت بۆ هەر ئەندامێک. ئەم چالاکییە ئاڵۆزە ڕۆڵی مێشکە، هەر بۆیە زیادبوونی قەبارەکەی وەڵامدانەوەیەکی سروشتی بووە بۆ فشاری ئەو ئەرکە زۆرەی لەسەری بووە، ڕێک وەکوو چۆن ئێمە سەنتەرێکی گەورەی هەشتا هەزار هێڵی دروست دەکەین لەبریی سەنتەرە کۆنەکان کە دە هەزار هێڵی بوو، ئەمیش بە هۆی زیادبوونی فشار و زیادکردنی ژمارەی بەشداربووان لە گەڕەکێکی دیاریکراودا بۆ نموونە.

لە سەرەتای دروستبوونی بوونەوەریشەوە، ئەو کاتەی بوونەوەری زیندوو تاکە خانەیەک بوو و کەرەستەکانی سادە بوون، خودی ماددەی زیندوو هەڵدەستا بە وەڵامدانەوە، ئیدی خانە بۆ دوورکەوتنەوە لە مەترسی دەچوویەوە یەک بەبێ ئەوەی پێویست بە دەزگای کۆئەندامی دەمار بێت. بەڵام بە گەشەکردنی بوونەوەری زیندووی فرەخانە و خاوەن چالاکیی هەمەجۆر، بڕێک خانە تایبەت کران بە گواستنەوەی ئاماژەکانی مەترسی، ئەم خانانەش سەرەتای مێشک بوون، ئیدی

بە ئاڵۆزتربوونی بوونەوەری زیندوو و هەمەچەشنبوونی فرمان و کەرەستە و چالاکییەکانی، هێڵەکانی ئەم مێشکە سەرەتاییەش زیادیان کرد و قەبارەکەشی دەستی بە زیادبوون کرد (ڕێک هاوشێوەی ئەوەی کە گەر زۆر ماسوولکەکانی قۆڵت بەکار بهێنیی لە بەرزکردنەوەی قورساییدا، قەبارەیان زیاد دەکات).

هۆکار زۆر بوو بۆ ئەوەی مەیموونی مرۆیی و دوای ئەویش مرۆڤ لە هەموو ڕەگەزەکانی تری گیانلەبەران مەبەست و چالاکییان زیاتر بێت، کە دواجار ئەمەش هۆکارە بۆ ئەوەی ئەو دەزگا تایبەتەی دەست دەگرێت بەسەر ئەو نیاز و چالاکییانەدا گەورە ببێت، ئەوەتا مرۆڤ تەمەندرێژترینی ناو گیانلەبەرانە، تەنها چەند کیسەڵێک و هەندێک جۆری درەخت نەبێت تەمەنیان درێژتر بوو، هەروەها مرۆڤ خاوەنی درێژترین ماوەی ساوایی و منداڵی و گەنجییە، لە ناوەندە تەمەنی شەست ساڵ، چل ساڵی لە ساوایی و منداڵی و گەنجیدا بەسەر دەبات و بە درێژایی ئەم ماوەیەش فێر دەبێت و ئەزموون و لێهاتوویی کۆ دەکاتەوە، هەر بۆیە پێویستی بە چالاکیی دەماری هەیە بۆ بەکارخستنی ئەم ئەزموونانە و هەڵگرتنیان. پاشان مرۆڤ بە چەند چالاکییەکی تایبەتی ئاڵۆز لەوانی تر جیا بووەوە، وەکوو بەکارهێنانی کەرەستەکان (پێش ملیۆنێک ساڵ). هەر وەک داهێنانی قسەکردن و تێگەیشتن و ژیان لە خێزان و کۆمەڵگادا و دۆزینەوەی ئاگر و بەکارهێنانی بۆ قازانجی خۆی (پێش نیوملیۆن ساڵ). پاشان ململانێیەکی بەردەوام لەگەڵ چەند چەرخێکی بەدواییەکداهاتووی بەستەڵەک (پێش ملیۆنێک ساڵ و تا هەزار ساڵ ڕۆیشتن). دواتر کشتوکاڵکردن و بەخێوکردنی ئاژەڵ و پیشەسازی و سەرقاڵبوون بە زانستەکان و بیرکاریی پەتی و هونەر و فەلسەفە (وێنەکێشان سی هەزار ساڵە دەر کەوتووە). پاش ئەمانەش درککردن

بە مردن و ئەو ئاماژانەی ورووژاندنی و ئەو خەیاڵانەی دروستی کردن. هەموو ئەم ئەزموونانە واتە ئەو دەزگایەی تایبەتە پێیان گەورە ببێت کە ئەویش مێشکە.

یەکێک لەو شتانەی گرنگیی ئەزموونەکان و پەیوەندییان بە مێشک و زیرەکییەوە دەر دەخات، ئەوەیە کە مێشکی نەهەنگ لە مێشکی مرۆڤ گەورەترە و لۆچەکانیشی زیاترە، بەڵام ئاستی زیرەکی و ژیریی نەهەنگ زۆر لە هیی مرۆڤ خوارترە، چوونکە بابەتەکە گەورەیی مێشک نییە بەتەنها، بەڵکوو گەورەییەکی هاوڕێ لە ئەزموون و لێهاتوویەکانیشدایە. سەرەنجامیش جیابوونەوەی مرۆڤە بە کەسایەتییەکی جیاواز لە پێشینەکانی لە ئاژەڵان، چوونکە ئەو تاکە کەسە دەتوانێت وێنا بکات و خەیاڵ بکات و ڕابمێنێت و دواجار ڕەهەندێکی گشتگیر بۆ ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو درک پێ بکات، پرسیاری مردن و پاش مردن بکات، بەڵام زیرەکترینی مەیموونەکان ناتوانێت خەیاڵ بکات و درک بە شتێک بکات بە ناوی داهاتوو، درککردنیشی بە ڕابردوو سنووردارە، بە جۆرێک بەڵێ خەفەت دەخوات بۆ بێچووە مردووەکەی تا ئەوەندەی لە بەردەمیدا دەیبینێت، بەڵام هەر ئەوەندە لە بەردەمی لات برد و ناشتت، ئەو بەتەواوی لەبیری دەکات.

یادەوەری بە واتا قووڵە گشتگیرە باقییەکەی شتێکە تەنها مرۆڤ هەیەتی. ئەنجامی گەشەکردنی یادەوەری لای مرۆڤ ئەوە بوو کە توانیی ئەزموون و لێهاتوویی و زانستەکان لای خۆی هەڵبگرێت و لە بڕیاردان و خەملاندن و ڕەفتارەکانیدا سوودیان لێ وەر بگرێت. پێدەچێت ڕێگای مێشکیش بۆ یادەوەری ملیۆنەها هێڵ و کێبڵی دەماری بن کە ناویان بەستەرە هێڵەکانە، ئەو هێڵانەی سەنتەرە جیاوازەکان پێکەوە دەبەستنەوە.

لە کۆتاییشدا، ئامانجی مرۆڤ لە بەکارخستنی مێشک و فیکر شتێکی زیاترە لە تەنها کەڵەکەکردنی زانستەکان و بەدیهێنانی بەرژەوەندییە زیندەییە خێراکان و گونجان لەگەڵ ژینگەی گۆڕاودا، ئامانجی ئەو شتێکی لەم مەبەستە بەردەست و نزیکانە مەترسیدارترە، ئەو هەوڵدەدات تێبگات. لە ڕاستیدا لە باڵاترین فەرمانەکانی ئەقڵ هەوڵە بەردەوامەکانیەتی بۆ پێکەوەبەستنی دیاردەکانی چواردەوری لە کۆمەڵێک پەیوەندیی گونجاو و ڕێکخراودا، بۆ هەڵێنجاندنی یاسا شاراوەکانی پشتیان و زانینی سیستمی نێو ناواخنی شتەکان و ئاشکراکردنی هۆکار و واتاکانیان لە یەک وشەدا، تێگەیشتن. ئەوەی کە لە واتای هەموو ئەمانە تێبگات، بەڵام بیرکردنەوە لەبەر سوود پێش تێگەیشتن هێشتا ئامانجە باوەکەیە و هێشتاش ئەو خاڵە ئەقڵ لە گەیشتن بە باڵاترین ئامانجەکانی دەکات. ئێمە بیر دەکەینەوە بۆ چنگخستن، بیردەکەینەوە بۆ جەنگ، زیرەکیمان لە ڕێگای دەستبەسەرداگرتن و قەڵەمڕەوی و هێزی ماددیی زیاتردا بەگەڕ دەخەین، بیر ناکەینەوە تا لە خۆمان و قەیرانە ڕاستەقینەکەمان تێبگەین، ئەنجامیش ئەوە دەبێت مرۆڤ بەرەو وێرانبوون هەنگاو دەنێت و بە خۆشی نازانێت.

ئەو مرۆڤەی بۆمبی ئەتۆمیی بەدەست هێناوە و ماسولکەی بۆ خۆی قەڵەو کردووە، هێشتا لە هەستەکانیدا منداڵێکی خۆپەرستە و لە ڕەوشتدا مەیموونێکی سەرەتاییە، ئەو بەرز نەبووەتەوە بۆ ئاستی ئەو هێز و بەرپرسیارێتییەی پێی گەیشتووە. هەر وەک خۆشی لەمە تێناگات، چوونکە ئەقڵی بۆ تێگەیشتن بەکار ناهێنێت، بەڵکوو بۆ بەخێوکردنی هێزی ماددیی زیاتر بەکاری دەهێنێت و تا زیاتر و زیاتر بکەوێتە نێو ئەو دژیەکییە بکوژەی نێوان هێز و ڕەوشتیەوە و وردەوردەش لە کاتژمێری سفر نزیک دەبێتەوە، ئەو کاتەی چیدی تێگەیشتن سوودێکی نابێت.

باڵندە و مێرووەکان لەگەڵ بارودۆخە گۆڕاوەکانیاندا خۆیان گونجاند و توانییان چاخە بەستەڵەکەکان بەسەلامەتی تێبپەڕێنن، بەڵام لەوە ناچێت ئێمە لەگەڵ ئەم هێزەدا کە بەخێرایی لەنێو دەستەکانماندا گەشە دەکات ڕابێین، چوونکە هەوڵ نادەین لە خۆمان تێبگەین.ئیدی لە ئانوساتدا دەکرێ ڕووداوەکە ڕوو بدات و ڕەگەزەکەمان لە جەنگێکی وێرانکەردا لەناو بچێت و ببینە تەنها لاپەڕەیەک لە مێژوو و کۆمەڵێک شوێنەوار کە ڕەگەزی دوای خۆمان لە دووتوێی بەردەکاندا بەدوایدا بگەڕێن.

ئایا پێویست نییە ساتێک بوەستین تا لە خۆمان تێبگەین؟



## دەروون و وتەکانی فرۆید

فرۆید وای وێنا کرد کە دەروونی مرۆڤ کۆکراوەی هاندەرە ئاژەڵییەکانە لە برسێتی و ترس و توورەیی و سێکس و ویست. هەر وەک وای دانا کە سێکس پێش هەموو ئەم پاڵنەرانە دەکەوێت و دەکرێت لەسەر بنەمای ئەم بنەما سێکسییە لە کەسایەتیی مرۆڤ تێبگەین و شیی بکەینەوە. نەخۆشییە دەروونییەکانیش دەکرێت لەسەر بنەمای ئەوەی کە کپکردن یاخود لادانی ئەم هاندەرە سێکسییەن، چارەسەر بکرێن. ئیدی بیردۆزی فرۆید دەربارەی دەروون و سێکس بوو بە تەوژمێکی کاریگەر بەسەر هەموو نووسەران و خوێنەران و بیرمەندانەوە.

لە سییەکان و چلەکانیشدا فرۆید بە جارێک هاتە ژیانمانەوە و تۆفانێک لە کتێبی بڵاو کردەوە، نموونەی: ئەقڵی ناوەکی، گرێی ئۆدیب، گرێی ئەلکترا، پێکهاتەی خۆبەکەمزانی و ڕاڤەی خەونەکان. هەر وەک کۆمەڵێک فیلمی فرۆیدیی بەرهەم هێنا هاوشێوەی (وەرگیراو)، کۆمەڵێک شانۆنووسی فرۆیدییش دەرکەوتن وەکوو تنیس ویلیامز، پاش هەموو ئەمانە لەپڕ خۆری ناوی فرۆید ڕووی لە ئاوابوون کرد تا ئێدلەر جێگەی بگرێتەوە. هەروەها لەبری بیردۆزی هاندەرە سێکسییەکان، چیدی گوێبیستی هاندەرە خودییەکان دەبووین. پاشان جارێکی تریش ناوی ئێدلەریش بەرەو ئاوابوون چوو و ناوی یۆنگ لە ئاسۆوە دەر

کەوت تا بواری گرنگیدان لە خودەوە بگوێزێتەوە بۆ ڕوح و هێزە پەنهانییەکان.

بەڵام فرۆید ئێستاش هەمان پیرۆزی دێرینی لە دەروونی گەنجەکانماندا هەیە، ڕەنگە هۆکاری ئەمە کەموکورتی و تەمبەڵی بێت لە خوێندنەوە و موتاڵاکردندا، ڕەنگیشە هیی ئەوە بێت کە وەڵامدانەوە بۆ بیردۆزێکی پەیوەست بە هاندەرە سێکسییەکانەوە لای گەنجێکی هەرزەکار زیاتربێت لە وەڵامدانەوە بۆ بیردۆزێکی قووڵتر و داماڵڕاوتر. کەسێک بێت و بڵێت ڕەفتار و بیرکردنەوە و هەستەکان لە خولگەیەکدا و بەدەوری ئارەزووی سێکسی و هاندەری سێکسیدا دەخولێنەوە؛ قسەیەکی زۆر خۆشە بەلای گەنجێکەوە کە لە قۆناغی هەرزەکاریدایە و هەموو هۆڕمۆن و ئەندامەکانی پاڵی پێوە دەنێن چۆن پاڵێک؛ بەرەو بیرکردنەوە لە ناوچەی زاوزێی لەشی. بەڵام گومانی تێدا نییە هەمان ئەم کەسە کاتێک دەگاتە لووتکەی پیاوەتی و پێگەیشتن و، بواری گرنگیدانەکانی فراوان دەبنەوە و هەست و بیرکردنەوەکانی دەچنە دەرەوەی چوارچێوەی ئارەزووەکانی تا لە ئاسۆگەلی فراوانتردا لە شەقەی باڵ بدەن،بۆچوونی دەربارەی فرۆید دەگۆڕێت.

بێ شک فرۆید بە ئامانجی بنیاتنانی ئەو پێشەکییە لۆجیکییانەی سەر دەکێشن بۆ بیردۆزەکەی دەربارەی هاندەرە سێکسییەکان، پەنای بردووەتە بەر ستەم و ناڕەوایی و هەڵچوونێکی زۆر. بۆ نموونە ئەوەی کە فرۆید پێی وا بێت منداڵی شیرەخۆرە بە چێژێکی سێکسییەوە گۆی سنگی دایکی دەگرێت، فرۆید لەکوێوە زانی کە ئەو هەستەی ئەو منداڵە هەستی پێ دەکات هەستی سێکسییە؟ گەر بیویستایە قسەکەی زانستی بێت، دەکرا تەنها بڵێت کە هەست بە چێژ و خۆشییەک دەکات، چوونکە گەواهیدەرە بابەتییەکان ئەوە دەر دەخەن، بەڵام ئەوەی کە هەر بەزۆر

ئەم چێژە بکرێتە چێژێکی سێکسی، ئەمە ئیتر سنووربەزاندنێکی نازانستی و ناوردە. چوونکە چێژی سێکسی تەنها دوای تەمەنی پێگەیشتن دێتە ئاراوە و ئەمەش دەرخەری نیازی بەلاڕێدابردنە لای فرۆید و دەرخەری ئەوەیە کە ئەو بە بیر و نیازێکی پێشوەختەوە دیاردەکان تاوتوێ دەکات، تا ڕاڤەیەکی سێکسیی لێ دروست بکات، کە ئەمیش شێوازێکی نازانستییە. بەڵام لە ڕاستیدا فرۆید زۆر لەم شێوازەدا ڕۆچووە، ئەوەندە بەسە کە بزانیت بۆ نموونە فرۆید چۆنها خولیای کۆکردنەوەی مۆری پۆستە ڕاڤە دەکات، تەماشا دەکەیت وای ڕاڤە دەکات کە ئەمە گوزارشتکردن و هەناسەدانە بە ئارەزوویەکی منداڵی کۆن، کە ئەویش چێژوەرگرتنە لە کرداری دەستبەئاوگەیاندن، بە جۆرێک منداڵەکە حەز لەوە دەکات دەرچەی پاشەڕۆی بگرێت و بۆ چەند ساتێک پاشەڕۆکە لە لەشیدا بهێڵێتەوە، ئا ئەم ئارەزووە لای پێگەیشتووان دەگۆڕێت بۆ خولیای کۆکردنەوەی مۆری سەر نامەکانی پۆستە. تا ئەم ڕادەیە فرۆید بۆ هەموو چالاکییەک هۆکارێکی سێکسیی نارەوا دادەتاشێت، تەنانەت بچینە سەر بالاترینی هونەرەکانیش، دەبینین فرۆید هیچێکیان لێ ناخوێنێتەوە بالابوونی ئارەزووە سێکسییەکان نەبێت، لای ئەو هونەر تەنها ڕاونانی مێیە بە هەڵبەست و سەمفۆنیا و گەمەکردنە بەدەمیەوە بە وێنە و تابلۆکان.

ئەگەر بێینە سەر گرێی ئۆدیبیش، خۆمان لە بەردەم بیرکردنەوەیەکدا دەبینین کە پێی وایە منداڵ لە ڕووی سێکسییەوە بە دایکیەوە دەبەستێتەوە و هۆگری دەبێت ئەگەرچی ئەم پەیوەستییەش ڕانەگەیەنێت و پراکتیزەی نەکات (بە حوکمی عورفی ئەخلاقی)، هەر بۆیە غیرە لە باوکی دەکات و ئاوات دەخوازێت لە کۆڵی بکاتەوە تا لەگەڵ تاقە مەعشوقەکەیدا کە دایکیەتی تەنها بێت. لە ڕووی مێژووییشەوە فرۆید پێی وایە کە ئەم

غیرەیە، غیرەی منداڵ لەو باوکەی لە عیشقی دایکیاندا ڕکابەرییان دەکات، سەرەنجام بە گەلەکۆمەکردنی منداڵەکان لە باوکیان بۆ کوشتنی کۆتایی دێت و دواجار ئەو منداڵانەی باوکیان لەکۆڵ کردەوە ئەم جارە لەنێو خۆیاندا دەکەونە ڕکابەری و شەڕ و ناکۆکی لەسەر دایکیان، چوونکە ژمارەیان زۆرە. پاشان هەستی پەشیمانی بەرامبەر کوشتنی باوکیان هەموویان دادەگرێت، بۆیە هەڵساون بە قەرەبووکردنەوەی ئەم پەشیمانییە بە پیرۆزڕاگرتنی یادی باوک و پاشان پەرستنی، ئینجا ئاژەڵێکیان لە ئاژەڵەکانی دارستان وەر گرتووە، پیرۆزیان کردووە و پەرستوویانە و کوشتنیان قەدەغە کردووە (وەکوو جۆرێک لە کەفارەت بۆ کوشتنی باوکیان، چوونکە ئەو ئاژەڵەیان وەکوو سیمبولێک بۆ باوک داناوە)، ئیدی بەم جۆرە باوک وێنەی ئاژەڵێکی پیرۆزی وەرگرتووە، پاشان زیاتر و زیاتر پێش کەوتوون و پەیکەرێکیان لە بەرد بۆ دروست کردووە تا فەرزەکانی پەرستشەکان و قوربانیی گوێڕایەڵیی پێشکەش بکەن، زیاتر پێش کەوتن و چیتر وەکوو خودایەکی ئاسمانی وێنایان کرد و پەرستنی باوکی ئاسمانی دەستی پێ کرد، لەگەڵ پەرەسەندن و پێشکەوتنی زیاتردا مرۆڤ بۆی دەرکەوت کە ئاسمان هیچی لێ نییە و ئەوسا بەتەواوی لە پەرستشەکان ئازاد بوو. بەم شێوەیە فرۆید پێی وایە کە پەرستنی خودا ئەڵقەیەکە لە زنجیرەی خەیاڵپڵاویی پەرستنی خودای باوک و ئاژەڵی پیرۆز و ئەمەش زنجیرەیەک لادانە کە کۆتاییەکەی دەگات بە ئەنجامێکی هەڵاودیو، وەک چۆن کەسێک دێت و دەڵێت زانستی پزیشکی بە نوشتە دەستی پێ کرد و هەر سەر بەو زنجیرەیەیە، لە پاکوخاوێنی و دەماربڕین و کەڵەشاخەوە هاتووە و لەمەشەوە دەچێتە سەر ئەوەی کە زانستی پزیشکی نوێ خەیاڵپڵاو و قسەی بەتاڵە و ئێمە لە داهاتوودا پێش دەکەوین و دەبینە

کۆمەڵگاگەلی بێپزیشکی، ئا ئەمە بیرکردنەوەیەکی هەڵاودیوە، چوونکە ئەوەی کە ڕاستیی بەرهەمی کۆتایی گەشتێکی دووورودرێژ بێت کە تیایدا ئەقڵ لەنێوان خەیاڵپلاو و نوشتەدا تێکەوتبێت، ئەوە ناگەیێنێت کە ئەم ڕاستییەی ئێستا هەر خەیاڵپلاوە، بەڵکوو پێچەوانەکەی ڕاستە کە ئەویش ئەوەیە ئەم ڕاستییە هەمیشە پێداگر بووە لەسەر ئەقڵ و هەستەکان، بە ڕادەیەک کە ئەو هەستانە پێیان وا بووە ڕاستییەکە لە خۆر و مانگ و لەو پەرستراوانەدا کە پەرستوویانن لە ئاژەڵ و بتەکان دەبینن، دواتر گەڕاونەتەوە و بۆیان دەر کەوتووە کە ئەو ڕاستییەی پێداگریی لەسەر دەکەن لەوە گەورەترە ئاژەڵێک یا هەسارەیەک و یانیش بتێک بێت. بەڵام وەکوو وتم، فرۆید بە نیازێکی پێشوەختەوە بیری دەکردەوە، هەر بۆیە بەناڕەوا ئەو ئەنجامانەی لە پێشەکییەکانەوە دەرهێناوە و لە هەڵێنجاندکەیدا زانستی نەبووە. دەیهەویست بیرۆکەی هاندەری سێکسی بەسەر هەموو شتێکدا بسەپێنێت، بۆ نموونە ئەگەر بێینە سەر بیردۆزەکەی لە ڕاڤەکردنی خەونەکاندا، ئەوا خۆمان لە بەردەم بیرکردنەوەیەکی زۆر ساویلکانەتر و ڕاستەوخۆتردا دەبینینەوە، چوونکە هەرچیی شتێک لە خەونەکاندا لاکێشە بن، لە دیدگای فرۆیددا ئاماژەیە بە ئەندامی نێرینەی پیاو، دارعەسا و مار و دار و منارە و بورج و چەتر و لقەدار، هەموویان هێمان بۆ ئەندامی زاوزێی نێرینە. هەرچییەکیش بازنە و کەلێنە، ئاماژەیە بۆ ئەندامی زاوزێی ژن. شووشە و قوتوو و ئەشکەوت و چاڵ و ئەڵقە و تایە، هەموویان ئاماژەن بە ئەندامی زاوزێی مێینە. هەرچیی جووڵەیەکیش بوونی هەیە، دووبارە هێمان بۆ پرۆسەی سێکس، ڕۆشتن و ڕاکردن و سەرکەوتن و فڕین و سەرکەوتنی پاسکیل یا عارەبانە و مەلەکردن و خۆهەڵدان، هەموو ئەمانە کرداری سێکسیی هێمایین. نەخۆشییە دەروونییەکانیش وەکوو شێتی و هیستریا ئەنجامی

کچکردن یا لادانی ئارەزوویەکی منداڵی خاوەن بنەڕەتێکی سێکسین، کە ئەویش ئەنجامی عورف و دابونەریتە ڕەوشتییەکانە کە ئەم ئارەزووە سێکسییانە بە چوارچێوەیەکی توندی پتەو لە قەدەغەکردن گەمارۆ دەدات. ناشزانم ئاخۆ فرۆید چی دەڵێت گەر بزانێت کە بەرزترین ڕێژەی شێتی لە ڕوسیا و سویدە، لە هەردوو وڵاتەکەشدا کێشەی کچکردنمان نییە و کێشەی سێکس هەر هەمووی چارەسەر کراوە، ئیتر نە زۆروتنی ئایینەکان و نە چەوساندنەوەی کەنیسە و نە عورفی ڕەوشتیی توندیش لە هیچیەک لەم دوو وڵاتەدا بوونیان هەیە.

ڕاڤەکەشی ئاسانە، مرۆڤ زۆر لەوە قووڵترە کە فرۆید وێنای کردووە و هەرگیز هاندەرێکی سێکسی نییە بەتەنها. گومانی تێدا نییە پشتبەستنی فرۆید بەو حاڵەتە نەخۆشییە دەروونییانەی دەهاتنە نۆرینگەکەی تا بەڵگەیەکیان لێ وەر بگرێت و بیردۆزەکەی لەسەر بنیات بنێت و بیگشتێنێت بەسەر هەموو ساغەکانی نێو مرۆڤایەتیشدا، یەکێکی ترە لەو لادانانەی فرۆید تێی کەوتووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێدلەر دەر کەوت تا بیسەلمێنێت کە تەنانەت خودی ئەم حاڵەتە نەخۆشییانەش دەکرێت بەبێ پەنابردنە بەر هاندەری سێکسی ڕاڤە بکرێن و ئەوەی کە هاندەری من و سەلماندنی خود هاندەری جەوهەری ڕەفتاری مرۆیین و تەنانەت خودی سێکسیش جۆرێکە لە جۆرەکانی سەلماندنی خود. هەروەها ئێدلەر توانیی بیسەلمێنێت ئەو نەخۆشانەی فرۆید کە فرۆیدییەکان پێیان وا بوو بە شیکارییەکانی فرۆید نەبێت چارەی دەردیان ناکرێت، توانرا بە شیکارییەکانی ئێدلەر چارەسەر بکرێن.

یۆنگیش هات تا بیسەلمێنێت من جەوهەری بوونی مرۆیی نییە و من هێزی ڕوحی و پەنهانی خۆی لە پشتە و خەونیش دەکرێت ئاشکراکردنی داهاتوو و بڕینی بەربەستی کات بێت و، خەونەکانی پێغەمبەرایەتی

خەیاڵپڵاو نەبوون، بەڵکوو ڕاستەقینە بوون، ئایین دەتوانێت بەهێزتر لە بیردۆزەکانی فرۆید و ئێدلەر شیفابەخش بێت و دەکرێت باوەڕ دژەژەهرێکی لە هەموو دەرمان و کتێبەکان کاریگەرتر بێت.

بەم شێوەیە لە شەستەکاندا ئاوابوونی بیری ماددیمان بینی، ئاوابوونی فرۆید و هەڵهاتنی قوتابخانەگەلێک بۆ بیرکردنەوەی دەروونیی نزیکتر لە مەتەڵی دەروون و مەتەڵی مرۆڤ و حەقیقەتی خودایەتی.



## نیشانەی پرسیار

وای دادەنێین کە ئێمە شۆڕبوونەوەی زنجیرەیەکی ئەڵقە پتەوی پەرەسەندووی کۆمەڵێک گیانلەبەرانی لە خۆمان نزمترین، ئەو گیانلەبەرانەش لای خۆیانەوە و لە گیانلەبەری خوارتر و خوارترەوە پەرەیان سەندووە تا ئەوەی ئەم بیردۆزی پەرەسەندنە دەمانگەیەنێتە زەمانێکی زۆر دووری ڕابردوو (هەندێک دەڵێن دوو هەزار ملیۆن ساڵ و هەندێکیش دەڵێن سێ هەزار ملیۆن ساڵ)، ئەو قۆناغەی ژیان کە لەوپەڕی سادەییدایە. لەوێدا لە بەردەم باوکی شەرعیی هەموو بوونەوەرە زیندووەکانداین لە گیانلەبەر و لە ڕووەک، کە بوونەوەرێکی زۆر ورد و سادەیە، تاکە خانەیەکە و هێشا تایبەتمەند نەبووە. تەنها دڵۆپێکە لە پرۆتۆپلازم و زیاتر لەو ئەمیبایە دەچێت کە لەژێر وردبیندا دەیبینین. شتێکە هەر دەڵێیت تفێکە و کراوە، دەجووڵێت و دەخوات و هەناسە دەدات، هێشتا هەمەجۆر نەبووە بۆ نێر و مێ و هیچ دەزگا و ئەندامێکی تایبەتمەندی تێدا دەر نەکەوتووە. بە دابەشبوون زیاد دەکات، پیر نابێت وەکوو ئێمە دەبین، بەڵکوو کاتێک دەگاتە لووتکەی گەنجی دابەش دەبێت بۆ دووان، پاشان هەریەکێک لەو دوو بەشە گەورە دەبێت تا ببێت بە دووانی دی، چوار دەبێت بە هەشت و هەشت بە شانزە و پاشان سیودوو و پاشان شەستوچوار، ئیتر بەم چەشنە لە چەند

کاتژمێرێکدا یەکێک دەبێت بە ملیۆن و ملیۆن دەبێت بە ملیار و ملیاریش بە ژینگە جیاوازەکاندا بڵاو دەبێتەوە. هەندێکیان ژیانی ڕووەکیی بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن و بە درێژایی ملیۆنەها ساڵ پەر دەسەنن بۆ هەموو ئەو پۆلانەی ڕووەک کە ئێستا دەیانبینین و هەندێکیشیان ژیانی ئاژەڵی بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن و پەرە دەسەنن بۆ هەموو ئەو پۆلانەی گیانلەبەر کە دەیانزانین لە ماسییەوە تا خشۆک و باڵندە و تا شیردەرەکان. هەموو ئەمانە ڕێی تێ دەچێت، بەڵام پرسیارەکە ئەمەیە: ئەو باوکە شەرعییە چۆن هاتە ژیانەوە؟ ئەگەر هەموو ژیانێک لە ژیانێکی سادەتر لە خۆیەوە پەرەی سەندووە. کەواتە ئەم باوکە شەرعییە، ئەم بوونەوەرە سادەیەی هیچ ژیانێک پێشی نەکەوتووە، لەکوێوە هاتووە و ئەگەر هیچ ژیانێک پێش ئەو بوونی نەبووە، ئەم لە چییەوە پەرەی سەندووە؟ ئایا لە نەبوونەوە هاتووە؟ ئایا لە ماددەیەکی مردووەوە بەدی هاتووە؟

جا چۆن زیندوو لە مردوو دروست دەبێت، چۆن بوون لە نەبوونەوە دێت؟ پرسیارگەلێک کە هیچ وەڵامێکیان بۆ نییە و زانست هیچی لەگەڵیاندا پێ ناکرێت گریمانەکردن و خەملاندن نەبێت.

یەکێک گریمانە دەکات بوونەوەری یەکەم لە ئاسمانەوە و لە نەیزەکی هاتوو لە هەسارەگەلی دوور و گەورەوە کەوتووەتە خوارەوە بەسەرماندا. کە ئەمەش وەڵامێکە دەمانباتەوە سەر هەمان پرسیار: ئەو بوونەوەرە یەکەمییانەی سەر ئەو هەسارە دوورانە لە چییەوە پێک هاتوون و لە چییەوە پەرەیان سەندووە؟

زانایەکی چاوقایمی دی لەولاوە دەڵێت کە ژیان لە ماددەی مردووەوە لە ئەنجامی ڕێکخستنێکی بێهاوتا لە گەردیلەکانیدا بەدی هاتووە، گەواهیدەریش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە ماددەی زیندوو لە هەمان ئەو

توخمە مردووانە پێک دێت کە لە بەرد و ئاو و گڵی چواردەورماندا هەیە، هەمان ئەو گەرد و گەردیلانە، کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین و نایترۆجین، بە ڕێژە و شێواز و پەیوەندیی بێهاوتا ڕێک خراونەتەوە تا ترشە ئەمینییەکان و پرۆتینەکان و نیشاستە و شەکرەکان بدەن بە دەستەوە، هەمان ئەوانەی لە ماددە زیندووەکاندا دەیانبینین، بە گریمانەکردنیشەوە ناوەستێت، بەڵکوو تاقیکردنەوەیەکی سەرنجڕاکێش پێشکەش دەکات، تیایدا پریشکێکی کارەبایی و تیشکی سەرووبنەوشەیی بە تێکەڵێک لە گازەکانی ئەمۆنیا و دوانەئۆکسیدی کاربۆن و میسان و هەڵمی ئاودا تێپەڕ دەکات، دواتر ئەنجامی کارلێکەکان کۆ دەکاتەوە تا شوێنەواری ترشی ئەمینی تێدا دەر بکەوێت. ترشە ئەمینییەکانیش بەوە دەناسرێن ئەو خشتانەن کە بینای زیندوویان لێ دروست کراوە، لە بەیەکداچوونی ئەو ترشانە بە جۆری جیاواز جۆرێکی تر لە پرۆتین پێک دێت، ئەمیش دەتوانێت بە ملیۆنەها ملیۆن ڕێگا بچێت بەیەکدا هەر وەک چۆن پیتەکانی زمانێک یەک دەگرن تا بێکۆتا گوزارشت و وشە و واتا دروست بکەن. هەمیشە ئەو پرۆتینە بەرهەمهاتووانەش ماددەی زۆر هەستیارن بە گەرمی و ساردی و ڕووناکی و کارەبا، بە کەمترین کارتێکەری دەرەکی شی دەبنەوە و پێک دێنەوە، کەواتە پرۆتینەکان خاوەنی سیفەتی جەوهەریی ژیانن کە ئەویش کاریگەربوونە بە ژینگە و کارتێکەرەکانی.

پێش سێ هەزار ملیۆن ساڵ بارودۆخی سەر زەوی گونجاو بوو بۆ دووبارەبوونەوەی ئەزموونێکی لەم جۆرە، کەشی زەوی تێکەڵەیەک بوو لە ئەمۆنیا و میسان و ئۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاو، بریسکەکانی کارەباش ئەم تێکەڵەیەیان دەبڕی و تیشکی سەرووبنەوشەییش بەئازادی لە خۆرەوە دەگەیشت و چەتری چینی ئۆزۆن بەم جۆرەی

ئێستا ڕوو دەدات بەری نەدەگرت (لە ئەنجامی دەرپەڕینی ئۆکسجین بۆ هەوا لە کرداری ڕۆشنەپێکهاتنەوە و بەیەکگەیشتنی ئەم ئۆکسجینە لەگەڵ تیشکی سەرووبنەوشەییدا لە چینە بەرزەکانی کەشدا، چەترێکی پارێزەر لە ئۆزۆن پێک هات کە ئەم تیشکە مەترسیدارە دەمژێت و ناهێڵێت بگاتە زەوی، مەگەر بە بڕی زۆر کەم نەبێت). کەواتە بارودۆخ بۆ پێکهاتنی ئەم پێکهاتە بێهاوتایانەی کە ناویان ترشە ئەمینییەکانە گونجاو بوو، ئیدی هەر لەگەڵ پێکهاتنیاندا لە ئاودا دەتوانەوە و لەگەڵ یەکدا یەکیان دەگرت بۆ پێکهێنانی ملیۆنان ئەگەری ماددەی پڕۆتینی. ئیدی هەر دەبوو جارێک لە جاران ئەم ترشە ئەمینییانە لەسەر شێوەی بێهاوتای ناسراو بە ترشی دیۆکسی ڕایبۆ نیوکلییەک DNAبەیەک بگەن، ئەو گەردەی ڤایرۆسەکانی لێ پێک دێت و توانای دووبارەکردنەوەی خۆی و دووهێندبوونی هەیە.

کۆمەڵێک گریمانە، هەریەکە ملی ئەوی تریان دەگرێت. زانستیش دەڵێت ئەم ئەگەرە ڕێی تێ دەچێت، کات دووردرێژە، هەزارەها ملیۆن ساڵ و هەلی بێکۆتا لە بەردەم ئەم گەردیلانەدا هەیە کە هەڕەمەکییانە و بە شێواز و وێنەی جیاواز یەک دەگرن و شی دەبنەوە.

خۆت وەکوو منداڵێکی نابینا بهێنە بەرچاو، یاری بە پیتەکان دەکەیت و هەڕەمەکییانە و بێ مەبەست لەیەکیان دەدەیت و دەیانخەیتە ڕیزی یەکەوە، بەبەردەوامی و بە درێژایی یەک هەزار ملیۆن ساڵ ئەم یارییە دەکەیت، هەر دەبێت جارێک بەختی کوێر ڕێکەوت بکات و بەبێ ئەوەی خۆت بزانیت ڕستەیەکی واتادار دروست بکەیت. زانایان دەڵێن هەمان ئەم یاسای ڕێکەوتە پشتگیریی ئێمە دەکات، ئەو مەیموونەی لەسەر ئامێری نووسین دادەنیشێت و بێکۆتا دەستی پێدا دەنێت، هەر دەبێت جارێک هەڵبەستێکی شکسپیری لێ دەر بچێت، مەگەر ئەگەری

بێکۆتا و کاتی بێکۆتای لە بەردەمدا نییە؟ کەسیش داوای هەڵبەستی شکسپیری نەکردووە، هەموو ئەوەی داوای دەکەن ئەوەیە کە ترشە ئەمینییەکان لەسەر شێوەی بێهاوتای DNA ڕێک بکەون و ئیتر ئەو ماددە بێهاوتایە خۆی کاروباری خۆی دەگرێتە ئەستۆ، بە میکانیزمی تایبەتی خۆی دوو هێند دەبێت و بەمەش تۆوی یەکەمی ژیان دادەنێت.

ئایا ڕێکەوت بوو؟

با وای دابنێین بڕوامان کرد کە گەردەکانی گڵ و ئاو بەڕێکەوت و کوێرانە لەسەر شێوەی ترشی سەرەتایی DNA بەیەک گەیشتن، پاشان ئەو ترشە بە ڕێگای ئۆتۆماتیکی خۆی دەستی کرد بە زۆربوون تا ملیۆنەها لەبەرگیراوە لە خۆی دروست بکات. بەڵام خۆ ئەمە هەموو ئەو ژیانە نییە کە ئێمە دەیبینین، بە قسەی ئەوان دەبێت بێین بڵێین باشە ئەوە یەکەکانی ئەم ترشە هاتن و بەڕێکەوت و کوێرانە خۆیان کردە سەر شێوەی خانەیەک، ئینجا دەبێت بێین بڵێین یەکێک لەو خانانە بەڕێکەوت و کوێرانە شێوەی ڕووەکی بۆ خۆی هەڵبژارد و خانەیەکی تریشیان دووبارە بەڕێکەوت و کوێرانە هێڵی ئاژەڵیی هەڵبژارد. پلەپلە بەم کلیلە جادوویییەوە بە درەختی ژیاندا سەر دەکەوین و لە هەرشوێنێکدا هیچمان بە دەستەوە نەما، دەڵێین ئەمە ڕێکەوتە. ئایا ئەمە بە ئەقڵەوە دەچێت؟

بەڕێکەوت باڵندە و ماسییە کۆچبەرەکان نیشتیمانی خۆیان لە دووریی هەزاران میلەوە و بە دەریا و بیابانەکاندا پێدەزانن؟ بەڕێکەوت زەرنەقوتە هێلکەکەی لە لاوازترین شوێنییەوە دەشکێنێت تا بێتە دەرەوە؟ بەڕێکەوت بەبێ برینپێچ برین خۆی سارێژ دەبێت و خۆی دەدوورێتەوە؟ بەڕێکەوت ڕووەکی گوڵەبەڕۆژە دەزانێت خۆر سەرچاوەی ڕۆزیی ئەوە

و ڕووی تێ دەکات و دوای دەکەوێت؟ بەڕێکەوت درەختەکانی بیابان تۆوی باڵدار بۆ خۆیان دروست دەکەن تا بە بیابانەکاندا ملی ڕێگە بگرن و جێگەیەک بدۆزنەوە بۆ ڕوان و تێراوی و باران باشتر بێت؟ بەڕێکەوت ڤایرۆس (دراکۆلای سەدەی بیستەم) ڕێگا تۆقێنەرەکەی لە دەستگرتن بەسەر خانەدا و دزینی ژیانی لە ناوەوە و لەناوبردنی دۆزییەوە؟ ڕووەک بەڕێکەوت بۆمبە سەوزەکەی (کلۆرۆفیل) دۆزییەوە و لە بەرهەمهێنانی وزەی ژیانیدا بەکاری هێنا؟ مێشوولە بەڕێکەوت کیسی سەرئاوکەوتنی بۆ هەریەکێک لە هێلکەکانی دروست کرد تا نەفەوتێن؟ یا ئەوەتا لەبەر ئەوەیە شارەزای یاساکانی ئەرخەمیدسە، یانیش ئەو دروستکارەی زانستی بە هەموو شتێک هەیە، ئیلهامی پێ بەخشیوە؟ ئەی ئەو مێروولەیەی ژەهر دەخاتە نێو سەنتەرە دەمارییەکانی کرمەوە تا ئیفلیجی بکات و پاشان ڕای بکێشێتە ناو لانەکەیەوە تا وەکوو خۆراکی یەدەگ هەڵی بگرێت بۆ بەچکەکانی، ئا ئەم چیرۆکە پێکەوەگرێدراوە بەڕێکەوت ڕوو دەدات؟ یا بە ئیلهامی ئیلهامبەخشێک؟ ئەو هەنگەی کۆمەڵگا و سیستەمێکی بۆ خۆی بەرپا کردووە و تەلارسازی پراکتیزە دەکات، پسپۆڕە لە کردارگەلی کیمیایی ئاڵۆزی وادا کە شیلەی گوڵ و گوڵزارەکانی پێ دەگۆڕێت بۆ شانە و هەنگوین، ئایا هەموویان بەڕێکەوت ئەنجام دەدات؟ ئەو مێرووی تەرمیتەی یاسا یەکەمییەکانی گونجاندنی هەوای دۆزیوەتەوە و سیستەمێکی چینایەتیی توند لە کۆمەڵگاکەیدا پیادە دەکات، ئایا بەڕێکەوت گەیشتووە بەمە؟ ئەو مێرووە ڕەنگاوڕەنگانەی بنەماکانی هونەر و ماکیاژ و شێوەی خۆگۆڕین و خۆحەشاردان فێر بوون، ئەو مێرووە بۆمبهاوێژانەی گازی ژەهراوی دروست دەکەن و دەریشی دەدەن، هەموو ئەمانە بەڕێکەوت و کوێرانە و هەڕەمەکییانە.ڕوویان داوە؟ بەڕاستی وتنی ئەم جۆرە

قسانە خودی ساویلکەییە، بیری ماددییش لە بەردەم ئەم ساویلکەییەدا خۆی لە ڕێگایەکی داخراودا بینییەوە، بۆیە هەوڵی دا ئەم وشەی ڕێکەوتە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە و گریمانەیەکی تر دابنێت، ئەویش ئەوە بوو کە وتی هەموو ئەم ژیانە سەرسوورهێنەرە بە ڕەنگ و چەشنە جیاوازەکانیەوە لە حاڵەتێکی پێویستییەوە دەستی پێ کردووە، وەکوو ئەو پێویستییەی کاتی برسێتی پاڵت پێوە دەنێت بۆ خواردن، دواتر بە ئاڵۆزبوونی ژینگە و پێداویستییەکانی ئەم پێویستییەش ئاڵۆزتر بووە و سەرەنجام ئەم هەمەڕەنگییە دروست بووە. ئەمەش تەنها یاریکردنە بە زاراوەکان، لە جێی ڕێکەوت وشەی ((ئاڵۆزبوونی پێویست))یان دانا، کە پێیان وایە هەر لەخۆیەوە ئاڵۆز دەبێت و لە تاقە ئاوازێکەوە گەشە دەکات بۆ سەمفۆنیایەک، ئەمە چۆن؟ چۆن تاقە ڕووداوێک بەبێ ئەقڵێکی دانەر گەشە دەکات بۆ چیرۆکێکی پێکەوەبەستراو؟ ئەسڵەن کێیە ئەم پێویستییەی پێویست کردووە؟ چۆن پێویست لە ناپێویستەوە دروست دەبێت؟ ئەمە پێداگیرییەکە بە خاتری خۆلادان لە ڕاستییەکی سروشتیی خۆڕسکی سادە کە خۆی بەسەر هەموو ڕووداوێکدا دەسەپێنێت، ئەویش ئەوەیە کە دروستکارێکی کارڕێکخەر و ئەقڵێکی گشتگیر ئەو دەستە ڕێنوێنیکار و دارعەسای مایسترۆیەیە کە هەموو ئەم ئۆرکسترایەی بەڕێوە بردووە. کەواتە ئەم خۆبەزلگرتنە لەپای چی؟ بۆچی بۆ خۆلادان لەو ڕاستییە ڕۆشنەی سروشت و بەداهەت لە ناواخنمانەوە هوتافی بۆ دەکێشێت پەلاماری مەحاڵ بدەین؟ گەر بەداهەتیشمان بەدرۆ خستەوە، ئەوسا چی لە ئەقڵمان دەمێنێتەوە کە خۆی سیستەمێکی لۆجیکییە لە بەڵگە نەویستراوەکان؟ واتای ئەمە ئەوەیە ئێمە ئەقڵی خۆمان بڕووخێنین بەو پێیەی بانگەشەی ئەوە دەکەین ئێمە ئەقڵانیی زانستیین و ئامانجمان بابەتیی و زانستییە.

ئایا نابینن چیرۆکی ژیان پەنجەیەکە لە هەموو قۆناغێک لە قۆناغەکانیدا ئاماژە بۆ ئەقڵێکی گشتگیر دەکات، کە داهێنانی کردووە و کاروبارەکانی ڕێک خستووە، بەپێی پێویست هەر بوونەوەرێک لە ئیلهامی خۆی پێ بەخشیوە، بگرە زۆر زیاتر لەوەی بەسەردا ڕژاندووە کە پێویستی پێیەتی. هەموو ساتێک فەیزێک لە نەخش و یاسا و نموونە و دەستوور و فێڵ و ڕێگا لەژێر لووتتدایە، هەزار ڕێگا تا بە هۆیانەوە بژیت، ئەمانە بەرێکەوت لە جێی خۆیاندا دانەنراون و لەخۆیانەوە نەهاتوونەتە بەردەستت.

ژیان بە ڕێنومایی زاتێکی داهێنەر لە ماددەی مردووەوە هەڵتۆقیوە، خودایەکی دروستکار لەپشت هەموو ئەوانەوە بوو. ئەگەریش ژیان لە ماددەی مردووەوە هەڵتۆقیبێت، ئەوسا دەبێت ئەگەرێکی ناواخنی خۆی بووبێت.

پاشان کوانێ ئەقڵی ئێمە لەپاڵ ئەم ئەقڵە گشتگیرە مەزنەدا؟ ئێمە لەکوێی دروستکاردابن؟ پرسیارەکان دووبارە دەگەڕێنەوە و دەکرێنەوە.



## کلیلی مەتەڵەکە

ئایا ئەقڵ تەنها چالاکیی مێشکە؟!

یا ئەوەتا ئەقڵ شتێکی دیکەی گەورەتر لە مێشکە!

پرسیارێکی حەیرانکەرە!

ئەگەر دەڵێیت ئەقڵ تەنها چالاکیی مێشکە، ئەمە واتا ئەقڵ بوونی نابێت تەنها ئەو کاتە نەبێت کە مێشک بوونی هەیە و تەنها کەسێک دەیبێت کە مێشکی هەیە، ئەمەش سەرەنجامێکە لەوە ناچێت ڕاست بێت. چوونکە ئەوەتا ئەو ڕوحلەبەرە تاکە خانەیەی کە هیچ شوێنەوارێکی مێشک یا دەزگای دەماریی نییە، بە سروشتێکی ژیرانە ڕەفتار دەکات، چاک و خراپی خۆی لەیەک دەکاتەوە و حەشارگەکانی مەترسی پێ دەزانێت و ڕوویان تێ دەکات. دەکرێت بە ژمارەی زۆر کۆ ببنەوە و لە شتێکی هاوشێوەی کۆمەڵگادا بژین، لەنێو ئەم کۆمەڵگا سەرەتاییانەشدا شتێک هاوشێوەی دابەشکردنی ئەرک و فرمانەکان دەگوزەرێت، بە جۆرێک برێک خانە تایبەتمەند دەبن بە کارێکی دیاریکراو و برێکی دیکەشیان لە کارێکی دیکەدا کە لە بەرژەوەندیی هەموو کۆمەڵەکەدایە، لە هەمان کاتیشدا هەر تاکێک پارێزگاری لە ئازادیی خۆی دەکات، ئەوەی بیەوێت ئاوەدانی جێ دەهێڵێت و بەتەنها سەری خۆی هەڵدەگرێت، ئەگەریش

کارەسات ڕووی دا و زەلکاوەکە بەرەو وشکبوون ڕۆیشت، یا لەپڕ سەرما زۆری هێنا، ئەو کات خۆی بە بەرگێکی پارێزەر چواردەور دەدات و لە دۆخێکی بێهۆشیدا، کە ڕەنگە چەندین ساڵ بخایەنێت، دەخەوێت، تا ئەو کاتەی هەلی بۆ دەڕەخسێت و لە بەرگەکەی دێتە دەرەوە و دەگەڕێتەوە بۆ ژیان.نموونەی ئەم ڕەفتارە ڕەفتارێکە ژیریی تێدایە، یاسای تێدایە و پەیوەستی لەنێوان هۆکار و دروستکەری هۆکارەکاندا لەخۆ دەگرێت، لەبەر ئەوە هەر دەبێت لەم ماددە زیندووە سەرەتاییەدا کە مێشکی نییە، سروشتێکی ژیر هەبێت ڕێگای پیشان بدات.

ئەگەر بێین و هێڵی ژیانیش تێبپەڕێنین و بچینە سەر ڤایرۆس، ئەو بوونەوەرەی هەر ئەوەندە کەوتە سەر خانەیەکی زیندوو چنگەکانی لە دیوارەکەی گیر دەکات و ماددە جادووییەکەی خۆی DNA دەخاتە نێوی، کە بەتەواوی ئەو خانەیە ئیفلیج دەکات و دەیکاتە خزمەتکارێکی ژێر فەرمانی خۆی، تا بە ملیۆنەها وشەی لە ماددەکەیەوە بۆ دروست بکات. ئەم داگیرکەرە خۆگۆڕەڕەی ویستی قوربانییەکەی دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و دەیکاتە بەندە، بگرە بۆ مەبەستی خۆی لەناوی دەبات، ئەم کارەی ناو بنێین چی، ئەوە نەبێت کە پلانێکی فێڵبازانەیە و پێکەوەگرێدراویی تێدایە، هەر دەڵێیت خودی ئەقڵ و ژیرییە.

زیاتر بڕۆین و هێڵی ژیان ببڕین دەگەینە ماددەی مردوو، ماددەی کیمیایی ئاسایی وەکوو گۆگرداتی مس یاخود خوێی چێشت، شەکر یا نیتراتی پۆتاسیۆم، نموونەی ئەم ماددانە گەر لە ئاودا و لە گیراوەی خەستدا توانماندنەوە و چاوەڕێمان کرد، پاش ئەوەی بڕێک لە ئاوەکە دەبێتە هەڵم چی ڕوو دەدات ، شتی سەیر دەبینین، چوونکە ئەو ماددانە دەکەونە خوارەوە و بنکی گیراوەکە، بەڵام بە شێوەی ئەندازەیی چوارگۆشە و شەشپاڵوو و شەشگۆشە و لوولەکی و تەشی شێوە،

پاشان گەشە دەکەن، هەر بلوورێکیان گەشە دەکەن و گەورە دەبن و پارێزگاری لە شێوە ئەندازەییە جیاوازەکەیان دەکەن، ئەگەریش بتەوێت ئەم بلوورانە بشکێنێت، پێویستت بە وزە دەبێت، ئەگەر فشاریشیان بخەیتە سەر، تەزوویەکی کارەباییان لێوە دەر دەپەڕێنێت. ئەم یاسا و ڕێسا ناوازەیە کە لە (نایاسا)وە سەرچاوە دەگرێت و ئەم قەوارەیە کە مۆرکێکی تایبەت و خودییەکی تاک بۆ خۆی وەر دەگرێت، ئایا هەستی ئەوەت پێ نابەخشێت کە ئەو لێرەیە؟

هەروەها ژیری لەناو ماددەی مردووشدا کار دەکات، سەیرە کە هەموو ماددەیەک دەبێتە بلوور، تەنانەت ئاسن و مس و ئەلەمنیۆم و گۆگردیش، تەنانەت تەختەش. هەموو ماددەیەک هەوڵ دەدات یاسا و ڕێسایەکی نایاب بۆ خۆی بگرێتە بەر و لە حاڵەتی پووکاوی و پەرشییەوە بچێت بۆ حاڵەتی ڕێکخراوی، هەر دەڵێیت ئەقڵێک کە لەناویدا پەرش کراوە و ئەم پلانە زۆر وردەی بۆ دادەڕێژێت.

ئەگەر هێڵەکەمان زیاتر بڕی و چووینە لای هەورەکانی تەپوتۆز و ئەو گازە سەرەتاییانەی ئەستێرە و گەلەئەستێرە و خۆرەکانی لێ دروست بووە، لەو گەشتەدا کە تەماشای لەدایکبوونی گەردوونە ئەستێرەییەکان و ماددە لە دۆخی سەرەتاییدا دەکەین، شتگەلی زۆر سەیرتر لە پێشوو دەبینین، ئەوەی بە شێوەی هەورێکی پرووکاوە لە تەپوتۆز دەستی پێ کردووە، ئەوەندەی نەخایاندووە بە کاری هێزێکی شاراوەی ناواخنی لەسەر شێوەی چەند گێژاوێک ڕێک خراوە، پاشان گێژاوێکی گەورەتر هەموو ئەم گێژاوانەی قووت داوە، دواتر ئەم گێژاوە چڕ دەبێتەوە و ناوکەکەی دەگۆڕێت بۆ خۆر و پریشکەکانی پەلەکانیشی بۆ ئەستێرە و هەسارەی بچووک بچووک، کە لەوپەڕی جوانی و مەزنیدا بەدەوری ناوەندا دەخولێنەوە، جارێکی دی یاسا و ڕێسا لە فەوزا و

نارێکییەوە سەرچاوە دەگرێت. جارێکی دی هەست دەکەینەوە ئەقڵ و ژیری پرژێنراوەتە ناو هەموو شتێکی زیندووەوە، ناو مردووشەوە، یا با بڵێین لە ڕاستدا چیدی شتێک نەماوە بە ناوی زیندوو و مردوو، بگرە هەموو شتێک ئێستا ژیر و زیندووە، هەر لە فەلەکی مەزنەوە هەتا گەردیلەی هەرە بچووک، کە لەویشدا ئەلکترۆنەکان زۆر بەڕێکی و لە ڕژێمێکی ناوازەدا بەدەوری ناوکدا دەخولێنەوە.

یاسا و ڕێسا لە هەموو شتێکدایە و جووڵە لە هەموو شتێکدایە، کەواتە کوانێ مەرگ و کوانێ نارێکی و کوانێ ناژیری؟

ئەو کەمەندکێشییەی لەنێوان دوو ئەستێرەدا ڕوو دەدات، کاتێک لەنێوان دوو تاک لە مرۆڤدا دەگوزەرێت ناوی دەنێین هەست و سۆز و ئەو تەقینەوەیەی لە دینامیتدا ڕوو دەدات، کاتێک لە دڵی ئێمە ڕوو دەدات ناوی دەنێین تووڕەیی و، هێزی پاڵنەری هەڵمی ئاویش لە مرۆڤدا ویست و ئیرادەیە. ئیدی ژیری و وزە و هەست و سۆز و مادده و ژیان و ویستیش لە کۆتاییدا نمایندەی یەک شتن، ئەوەندە هەیە بەپێی ئەو هەڵوێستەی تیایدا وەستاوین و لێیەوە تەماشای شتەکان دەکەین، ناوی جیاوازیان لێ دەنێین.

بیری هاوچەرخ مەیلی بەرەو ئەوەیە بەربەستەکانی نێوان ژیان و مەرگ و ژیری و ناژیریی تێک بشکێنێت. چیدی مەرگ نەماوە، ناژیری نەماوە، بەڵکوو ژیان لە هەموو شتێکدا هەڵدەقوڵێت و یەک شانەیی لەنێوان هەموو بوونەوەراندا بوونی هەیە. ئەوەشی لای ئێمە لە دیاردەی هەمەجۆر دەچێت، لە ڕاستیدا شاراوەکانی ئەم یەکێتییە پڕ فەڕ و قووڵەیە، ئەو ناکۆتایەیە کە هەموو ئەگەرەکانی لەخۆ گرتووە و ئەو ژمارە تەواوەیە کە دابەش دەبێت بۆ هەموو نیوە و چارەک و

کەرت و ڕەگێک و بە هەموو ئەو دابەشکارییە جەبرییە بێکۆتایانەوە کە لە کتێبی جەبردا هەیە. ئەو گڵەی توانیویەتی لەسەر شێوەی ماددەی زیندوو و خانە و ڕووەک و ئاژەڵ و مێشک و دەزگای دەماری لە هەموو ئاست و جۆرەکانیشدا ڕێک بکەوێت، ئەمەش بە ڕێنوێنیی ئەو ژیرییە گشتگیرەی ناواخنی و بە ئیلهامی ئەو و لەبەر ئەوەی کە ژیرییەکی گشتگیرە نەک ژیریی تایبەتی من و تۆ، بەڵکوو ژیریی تاک و بەرز و بێوێنە و دەستڕۆیشتوو بەسەر ئێمەدا و بەسەر هەموو شتێکدا، ئیلهامبەخشی هەموو دروستکراوەکانی، یاخود ئەگەر دەتەوێت ورد بێت، بڵێ زاتی تاک و تەنهای باڵای داهێنەر.

جیهانی زیندوو تایبەتمەندیی خۆی هەیە کە جیای دەکاتەوە لە جیهانی مردوو، ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەم ڕاستییە لێرەدا ڕێژەییە، چوونکە ئەم تایبەتمەندییانە دەچنەوە یەک و جیا دەبنەوە لە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان مردوو و زیندوودا و دەمانخەنە ناوچەی لێکچوو و نزیکییەوە، وەک بڵێیت هێشتا لە ناوچەی زیندوودایت و تێمان نەپەڕاندووە، لەپڕ لەپشت دژیەکی و جیاوازی و هەمەجۆرییەکانەوە یەکێتیمان بۆ دەر دەکەوێت، لەپڕ جیهانی مردوو لە بەردەمماندا بە ترپەی دڵی تایبەتی خۆی ترپە لێدەدات و تەماشا دەکەین یاسا و جووڵە و وزە و کردار و کارلێک و پەرەسەندنی تێدایە، تەماشا دەکەین لە بەردەم جیهانێکی زیندووی ژیرداین، بەڵام لەسەر شێوازی خۆی. ئەم دیدگا نوێیەی زانستیش بۆ بوون و بۆ گەردوون دەیخاتە ئەو ناوچە قەدەغەکراوەوە کە لەمێژە سۆفییەکان بۆ خۆیان قۆرخ کردووە.چوونکە بەڕاستی زانستێکە لە تەسەوف دەچێت، زانستێکە لە ڕاستیدا خودی ئایینە لە حەقیقەتی خۆیدا و هەمان تۆنی ئاڵۆزی سۆفییەکان وەر دەگرێت و هەمان بارگە سۆزدارییەکانیان و باڵگرتن و شەتەحاتەکانی ئەوان

دووباره دەکاتەوە، بەڵام ئەویش دەکەوێتە ناوچەی تەمومژاویی واوە، کە بینین تیایدا سەختە و ڕوونبوونەوەی هەڵە دژوارە و، دژوارە ڕێگاکە بدۆزرێتەوە، خەریکە نەزانین ئاخۆ دەتوانین زیاتر ببینین یا ئەوەتا گەیشتووینەتە لێواری توانراو و خەملاندن و گریمانەکردن و، خەوبینین نەبێت هیچمان بۆ نەماوەتەوە!

ئیدی ئا لێرەدا و لە لێواری ئەم تەمومژەدا جوانترین هەڵبژاردە بێدەنگییە، چوونکە ئەقڵ هەموو ئەوەی وت کە هەیبوو. لێرەدا ئیدی ڕۆڵی ئایین دەست پێ دەکات، کاتێک زانست قسەی خۆی دەکات و بێدەنگ دەبێت، ڕۆڵی پێغەمبەر دێتەوە پێشەوە تا لە ڕوانگەی ئەو سرووشەوە قسە بکات کە لە جیهانی پەنهانەوە هانیویەتی، تا دەستمان بگرێت لە زانستەوە بۆ ئەوپەڕی زانست، بەرەو خودای بەرز و بێوێنە و خودان ناوی پیرۆز.



## نـــاوەڕۆك

# مەتەڵی ژیان

**ژیان چییە و نهێنییەکەی چییە؟**

ئەوە کێیە زەڕنەقوتەی فێرکردووە کە هێلکە لە لاوازترین شوێنییەوە بتروکێنێت و بێتە دەرەوە. کێ فێری باڵندەکانی کردووە بەنێو زەریا و بیابانەکاندا کۆچ بکەن و بچنە شوێنێک کە خواردنی زۆرتر و کەشوهەوای باشتر بێت و بۆ زۆربوونیان گونجاو بێت و، ئەوە کێیە بە درێژایی ئەم گەشتە و هەزاران میل هەنگاوەکانیان ڕاست و دروست و پاڵپشت دەکات، ئیدی نە ون دەبن و نە ڕێیان لێ تێک دەچێت. کێیە کرمی ئاوریشمی فێر کردووە جار لەدوای جار بەرگ و پۆشاکی خۆی بچنێتەوە، پاشان بچێتە سووچێکەوە تا قۆزاخەیەک لە ئاوریشم بۆ خۆی دروست بکات، چەندین شەوگاری دووردودرێژ هەر وەکوو یارانی ئەشکەوت تیایدا بخەوێت و، دواتریش هەر لەوێوە ببێتە پەپوولەیەکی سپیی جوانی نەخشین و بێتە دەرەوە.

07501269689
07511408868

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆموڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)



٤٠٠٠دینار

ISBN:9-34-686-9922-978

